# وەڵامە دەمکوتکەرەکان

وەرگێڕان و ئامادەکردنی:
سەلمان کانەبی

چاپی یەکەم
٢٠١٧

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

إن الحمدلله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لاإله إلاّ الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله وبعد:

هونەری وەڵام دانەوە یەکێکە لە هونەرەکان، ئەویش ئەوەیە وەڵامێکی بەهێزی بەرامبەرەکەت بدەیتەوەو وای لێبکەیت کە بێدەنگی بکەیت، بەهای ئەم هونەرە لە خێراییەکەی دایە، بەم هونەرە دەتوانیت سەرنجی دەوروبەر بۆ لای خۆت ڕابکێشیت، جوانترین وەڵامیش ئەوەیە کە ئەو کەسە دەمکوت بکات کە ناحەقەو ئەو کەسە سەرسام بکات کە لەسەر حەقە.

وە جوانترین وەڵام بۆ کەسی دەمپیس، یان ئەو کەسەی دەیەوێت گاڵتە بە خەڵك بکات، وەڵامی دەمکوتکەرە، کە بێ دەنگی دەکات و پەشیمانی دەکاتەوە لەوەی کە ئەم پرسیارەی کردووەو دەبێتە وانەیەك بۆی. هەروەها دەبێتە پەندێکیش بۆ کەسانی تر هەر وەك چۆن جارێك

"نەصری کوڕی یەسار" پیاوێکی دەشتەکی بینی زۆر بە تامەزرۆییەوە نان دەخوات، پرسیاری لێ کرد: ئەی پیاوی دەشتەکی تا ئێستا تێر نانت خواردووە؟ دەشتەکیەکە وتی: لە ماڵی تۆو باوکی تۆ نەخێر.. نەصر زۆر تەریق بوویەوە وتی: خۆزگە لاڵ دەبووم بەس ئەو پرسیارەم نەدەکرد.

لە چەندین کات و شوێندا پێویستیت بەوە دەبێت وەڵامێکی دەمکوتکەرو بێدەنگکەرت پێ بێت. بۆ نمونە کاتێك یەکێك دەیەوێت گاڵتەت پێ بکات و خەڵك پێت پێ بکەنێت. هەر وەك چۆن پیاوێك بە "موتەنەبی" شاعیری وت: لە دورەوە بینیمیت وامزانی کە ژنیت! ئەویش وەڵامی دایەوە منیش لە دورەوە تۆم بینی وامزانی کە پیاویت!! هەروەها کاتێك یەکێك دەیەوێت خۆت بەسەردا هەڵبکێشێت و خۆی زاڵ بکات بەسەرتدا، هەر وەك چۆن نوسەرێك بە "بەرنادشۆ"ی نوسەری بەناوبانگی وت: من باشترم لە تۆ، تۆ لەپێناوی پارەدا دەنوسیت منیش لە پێناوی شەرەفدا! ئەویش وەڵامی دایەوە" ڕاست دەکەیت، هەریەك لە ئێمە بۆ ئەو شتە دەنوسێن کە نیمانە!! هەروەها زۆر جار بۆ خۆ دەربازکردن لە مەوقیفێك کە توشی دەبیت، بۆ نمونە... پیاوێك لە گوندێك وتارێکی خوێندەوە بۆ پشتیوانی کردن لە حیزبی کرێکاران، لە کۆتاییدا وتی: ئایا لەدوای ئەوە هیچ کەسێك هەیە بەرپەرچی ئەوە بداتەوە کە حیزبی کرێکاران باشترە لە پارێزگاران؟ دوای ئەوەی ئەو قسەیەی کرد یەکسەر کەرێك زەڕاندی هەموو ئامادەبووان پێکەنین...پیاوەکە وتی: ئێستا بۆتان سەلما کە تەنها کەرەکان بەرپەرچی ئەوە دەدەنەوە.

وە هەروەها کاتێك دادوەری لە نێوان دوو کەسدا دەکەیت، دەبێت وەڵامێکی وات پێ بێت قەناعەتیان پێ بکەیت. بۆ نمونە، دوو کەس بوو بە مشتومڕیان و چوونە لای قازییەك، یەکێکیان وتی: ئەو پیاوە کۆڵێکی قورسی هەڵگرتبوو، کەوتە سەر زەوی و داوای لە من کرد یارمەتی بدەم، منیش وتم چیم دەدەیتێ ئەگەر یارمەتیت بدەم؟ وتی: هیچ، منیش ڕازی بووم و کۆڵەکەم هەڵگرت، ئێستا دەمەوێ هیچەکەم بداتێ... قازی وتی سکاڵاکەت تەواوە کوڕم، نزیك بەرەوە لێم و ئەو کتێبە بەرز بکەرەوە. کاتێك بەرزی کردەوە، پێی وت: چیت دۆزیەوە لە ژێری؟ پیاوەکە وتی: هیچ.. قازی وتی دەی هەڵی گرە بۆ خۆت و بڕۆ!.. هەروەها لە چەندین کات و شوێن و بارودۆخی تری ژیاندا، پێویستت بەوە دەبێت وەڵامێکی دەمکوتکەرو بێدەنگکەرت پێ بێت.

مەبەست لە کۆکردنەوەو وەرگێڕانی ئەم وەڵامە جوان و دەگمەنانەش بۆ چێژ وەرگرتن و سود وەرگرتنە لە ئەدەبی پێشینان، لە کۆندا وتویانە دانا ئەو کەسەیە پەند لە ئەزمونی کەسانی تر وەردەگرێت، بۆیە پێویستە سوود لە ئەزمونی کەسانی تر وەربگرین بۆ پەرەپێدانی تواناکانمان و تێگەیشتنمان لە ژیان.

لە کۆتاییدا دەڵێم: مەهێڵە هیچ کەسێك سواری پشتت بێت، تۆ لەبەر دەستی خۆتدایت، ئەو کەسەی دەبینێت کە ناتوانیت وەڵامی بدەیتەوە، وا دەزانێت شتێکی گەورەی کردووەو زاڵ بووە بەسەرتدا، مەهێڵە تامی

سەرکەوتن بکات و لەسەر حیسابی تۆ دڵخۆش بێت، بەڵکو نیشانی بدە کە ئەو زەرەرمەندی گەورەیە لەو قسەیەی کە کردوویەتی.

سەلمان کانەبی

# وەڵامە دەمکوتکەرەکان

*پیاوێکی ئێسك قورس چوو بۆ لای زانایەکی نەخۆش ماوەیەکی زۆر لای دانیشت پاشان وتی: ئەی شێخ ئامۆژگاریم بکە.
زاناکە وتی: ئەگەر چویتە لای نەخۆش زۆر لای دامەنیشە.

* پیاوێك زۆر ڕقی لە زۆر بلێیی بوو لەلای سەرتاشێك دانیشتبوو سەرتاشەکە ئەوەندە قسەی کرد بیزار بوو کاتێك سەرەی سەرتاشینی پیاوەکە هات سەرتاشەکە وتی: چۆن سەرت بۆ بتاشم؟
پیاوەکە وتی: بە بێدەنگی.

* ئەکتەرێك لەسەر تەختی شانۆ وتی: ئەو ئاواتەی من هەمە ئەوەیە ئەسپێکی ڕەسەن بەدەست بهێنم، ئامادەم هەموو سەروەت و سامانەکەم ببەخشم لەپێناوی ئەوەدا.
یەکێك لە تەماشاکاران بە گاڵتەوە وتی: ئەگەر کەر بێت نابێت؟
ئەکتەرەکە وتی: با وەرە.

*پیاوێك بە گاڵتەوە بە دکتۆرێکی وت: پێدەچێت دکتۆری ئاژەڵان بیت.
وەڵامی دایەوە: بەڵێ... بۆچی؟ نەخۆشیت؟

* ئافرەتێك بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشت چەند کەرێکی لە پێش بوون لێی دەخوڕین، دوو گەنج پێی گەیشتن وتیان: سڵاو دایکی کەرەکان.
ئەویش وەڵامی دانەوە وتی: سڵاو کوڕەکانم.

* خانمێکی زۆر قەڵەو سواری پاسێك بوو .
یەکێك لەسەرنشینانی پاسەکە وتی: نەمزانی ئەم ئۆتۆمبێلە تایبەتە بە فیل.
خانمەکە بە هێمنی وەڵامی دایەوە: نەخێر بەڕێزەکەم، ئەم ئۆتۆمبێلە وەك کەشتی نوح وایە، فیلیش سوار دەبێت و کەریش سوار دەبێت.

* ڕۆژێکیان ئیبراهیمی گۆرانیبێژی ڕەشید گۆرانی بۆ ڕەشید دەوت کاتێك تەواو بوو پێی وت: بەڕاستی چاکت کرد خوا چاکەت لەگەڵ بکات.
ئیبراهیم وتی: خوا لە ڕێگەی تۆوە چاکە لەگەڵ مندا دەکات.
ڕەشید فەرمانی کرد سەد هەزار درهەمی بدەنێ.

* پیاوێك وتی: هەرکاتێك کەوتبمە ناو کێشەیەکەوە ئەوەندە ئاسان خۆم لێی ڕزگار کردووەو هاتوومەتە دەرەوە وەك چۆن مویەك لەناو ماست دێنیتە دەرەوە.
یەکێك وەڵامی دایەوە: من هەرگیز نەکەوتوومە ناو کێشەوە.

* هەژارێك لە دەرگای ماڵی ڕەزیلێکی داو داوای کرد شتێکی بدەنێ.
پیاوەکە وتی: خانمەکان لە ماڵ نین خوا ڕزقت بدات.
هەژارەکە وتی: من داوای ژنم نەکردووە بەڵکو داوای کولێرەیەکم کردووە.

* کاتێك پیاوێکی ڕەزا قورس بە شاعیری بەناوبانگی عەرەب ( بشار بن برد)ی نابینای وت: هیچ نابینایەك نیە ئیلا خوا بە شتێکی تر قەرەبووی کردوەتەوە، تۆی بەچی قەرەبوو کردۆتەوە؟
وەڵامی دایەوە: منی بەوە قەرەبوو کردۆتەوە کە نمونەی وەك تۆ نەبینم.

* پیاوێك سەیری دوو ئافرەتی کرد کە یارییان دەکرد پێی وتن: نەفرەتی خواتان لێ بێت ئێوە بوون خەریك بوو یوسف پێغەمبەر لە خشتە بەرن.
یەکێکیان وتی: ئەی کێ بوو خستیە ناو بیرەوە، ئێمە یان ئێوە؟!

* نابینایەك هاوسەرگیری لەگەڵ کچێك کرد
کچەکە وتی: ئەگەر جوانی و سپیەتی منت دەبینی سەرسام دەبویت.

نابیناکە وتی: ئەگەر بەم شێوەیە بای کە دەڵێیت، چاوساغان بۆ منیان جێ نەدەهێشتیت.

* ئافرەتێکی زۆر ناشیرین بە پیاوێکی وت: ئەگەر مێردی من بوایت ژەهرم دەکردە ناو قاوەکەتەوە.
پیاوەکە وتی: ئەگەر خێزانی من بوای یەك دەقە نەدەوەستام یەکسەر دەمخواردەوە.

* جوحا چووە ناو گوندێکەوە یەکێك پێی وت: ئەی جوحا نەمناسیتەوە بە کەرەکەت نەبێت.
جوحا وتی: دەی کەرەکان یەکتر دەناسنەوە.

* وەزیرێکی قەڵەوی بەریتانی بە بەرنادشۆی لاوازی وت: ئەوەی تۆ ببینێت وا گومان دەبات کە بەریتانیا لە ئەزمەی خۆراکدایە.
بەرنادشۆ وتی: وە ئەوەی تۆش ببینێت دەزانێت هۆکاری ئەزمەکە چیە.

* پرسیار لە مەلیك فەیسەڵ کرا: دەبینین مووەکانی ڕیشت ڕەشن و مووەکانی سەریشت سپین؟
وەڵامی دایەوە: مووەکانی سەرم بیست ساڵ پێش مووەکانی ڕیشم هاتوون.

* پیاوێك ژنێکی بینی پێی وت: ئای چەند جوانیت!
ژنەکە وتی: خۆزگە تۆش جوان بوایت بۆ ئەوەی هەمان قسەت پێ بڵێم.
پیاوەکە وتی: کێشە نیە تۆش وەکو من درۆ بکە.

* چەند کەسێك لای موزەبید وەستا بوون کە مەنجەڵێکی لەسەر ئاگر دانا بوو گۆشتی تێدا بوو دەیکوڵاند، یەکێکیان پارچە گۆشتێکی هەڵگرت و خواردی و وتی: مەنجەڵەکە پێویستی بە خوێیە، پاش کەمێکی تر یەکێکی تر پارچە گۆشتێکی دەرهێناو خواردی وتی: مەنجەڵەکە پێویستی بە بەهاراتە، پاش کەمێکی تر یەکێکی تر پارچە گۆشتێکی دەرهێناو خواردی وتی: مەنجەڵەکە پێویستی بە بیبەرە، موزەبیدیش پارچە گۆشتێکی دەرهێناو خواردی وتی: مەنجەڵەکە پێویستی بە گۆشتە.

*دەشتەکیەکی نەوسن و زۆرخۆر لای فەرمانڕەوایەك بوو، فەرمانڕەواکە وتی: چیە وا ئەو بەرخە دەخۆیت دەڵێی دایکی قۆچی لێداویت؟
وەڵامی دایەوە: ئەی تۆ چیتە بەزەیت پێدا دێتەوە دەڵێی دایکی شیری پێداویت؟

* پیاوێك بە بەرنادشۆی وت: ئایا چێشتلێنەر سودی زیاتر نیە بۆ گەل لە شاعیرو نوسەر؟

بەرنادشۆ وتی: سەگەکان باوەڕیان وایە.

* دەگێڕنەوە کە ڕۆژێك وەزیر بە پەهلولی وت: ئەی پەهلول خۆت ئامادە بکە خەلیفە تۆی کردووە بە فەرمانڕەوا بەسەر بەرازو سەگەکاندا ؟

پەهلول وتی: کەواتە گوێ بگرەو گوێڕایەڵ بە لەبەرئەوەی لەژێر فەرمانڕەوایەتی من دایت.

*ئەستێرەیەکی ئینگلیزی بە هنری جانسونی فەرەنسی وت: شتێکی بێزارکەرە من ناتوانم لە پاریس نینۆکەکانم بە پاکی بهێڵمەوە.

وتی: لەبەرئەوەی زۆر خۆت دەخورێنیت.

* هەژارێك داوای لە پیاوێکی دەشتەکی کرد کەیارمەتی بدات و خێری پێ بکات.

پیاوەکە وتی: هیچم نییە بیدەم بە کەس ئەوەی هەمە لە هەموو کەس زیاتر پێویستیم پێیەتی.

هەژارەکە وتی: باشە ئەو کەسانە لە کوێن چاکە و پیاوەتییان لە دەست دێت؟

پیاوەکە وتی: لەگەڵ ئەو کەسانەدا ڕۆیشتن کە داوا لە کەس ناکەن.

* پیاوێك خانوێکی کۆنی بە کرێ گرت کە دارەکانی سەقفەکەی ڕزی بوون و هەر قرچە قرچیان بوو.
کاتێك خاوەنی خانوەکە هات کرێچیەکە وتی: ئەم سەقفە چاك بکە هەر قرچە قرچیەتی خەریکە دەکەوێت.
خاوەنی خانوەکە وتی: مەترسە هیچ نییە ئەوە زیکری خوا دەکات.
کرێچیەکە وتی: ئاخر دەترسم لەناکاو کڕنوش بەرێت.

* دەشتەکیەکی دەم خوار لەبەرامبەر فەرمانڕەوایەك وەستاو هۆنراوەیەکی جوانی بەسەردا خوێندەوە کە هەمووی ستایش و پیاهەڵدان بوو بەسەر فەرمانڕەواکەدا بۆ ئەوەی پاداشتی بکات، بەڵام فەرمانڕەواکە هیچی نەدایە.
پاشان فەرمانڕەواکە وتی: ئەوە دەمت بەچی خوار بووە.
شاعیرەکە وتی: لەوانەیە سزایەك بێت لەلایەن خواوە لەبەرئەوەی زۆرم بە درۆ مەدح و ستایشی هەندێك کەس پێ کردووە.

* دوو کەس کێشەیان هەبوو لەسەر باخێك و هەریەکەیان دەیوت هی منە، پیاوێك هاتبوو بۆ ئەوەی شاهێدی بۆ یەکێکیان بدات بەوەی کە باخەکە هی ئەوە.. قازی پرسیاری لێ کرد ئەو باخە چەند داری تێدایە؟
پیاوەکە وتی: نازانم بە دیاری کراوی چەند داری تێدایە.
قازی وتی: ئەی چۆن شاهێدی دەدەیت؟

پیاوەکە وتی: ئەی جەنابی قازی تۆ چەند ساڵە لێرەدا دادوەری دەکەیت؟

وتی: نزیکەی بیست ساڵە.

پیاوەکە سەری بەرز کردەوەو سەیرێکی سەقفی ژورەکەی کردو وتی: ئەم سەقفە چەند داری تێدایە؟

قازی وتی: نازانم.

پیاوەکە وتی: ئەی تۆ بیست ساڵە لێرەدا دادوەری دەکەیت چۆن نازانیت چەند داری تێدایە؟!

قازی قسەی پێ نەماو ناچار بوو شایەتیەکەی وەر بگرێت.

* عەمری کوڕی عاص دەڵێت: سەرسام بووم بە قسەی ئافرەتێك کە مەنجەڵێکی پێ بوو بە پەڕۆیەك داپۆشرا بوو وتم: ئەوە چی تێدایە؟

وتی: ئەی بۆچی دامان پۆشیوە؟!

* فەرەزدەقی شاعیر دەڵێت: جارێکیان هۆنراوەیەکم دەخوێندەوە هەستم کرد منداڵێك زۆر سەرسامە پێم.. کاتێك هۆنراوەکەم تەواو خوێندەوە چوومە لای منداڵەکەو پێم وت: حەز دەکەی من باوکت بام؟

منداڵەکە وتی: نەخێر حەز دەکەم دایکم بوای.

* شەدادی حارثی دەگێڕێتەوە دەڵێت: جارێکیان بە پیاوێکی ڕەش پێست گەیشتم کە مەڕی دەلەوەڕاند پێم وت: ئەم مەڕانە هی کێن ئەی پیاوی ڕەش؟

وتی: هی گەورەی ناوچەکەن ئەی پیاوی کەچەڵ!

وتم: جا بۆ تورە دەبیت ئایا ڕەش نیت؟

وتی: ئەی تۆ بۆ تورە دەبیت ئایا کەچەڵ نیت؟

* فەرمانڕەوایەك لە دوای مەلایەك نوێژی دەکرد کە نوێژی زۆر درێژ دەکردەوەو قورئانی زۆری تێدا دەخوێند.

فەرمانڕەواکە لەبەردەم خەڵك لێی توورە بوو پێی وت: لە ڕکاتێکدا تەنها یەك ئایەتی تێدا بخوێنە.

بۆ نوێژی دواتر دوای ئەوەی سورەتی (الفاتحة ) ی خوێند ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ **وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا** ﴾. الأحزاب:٦٧

واتە: وە دەڵێن: ئەی پەروەردیگارمان بەڕاستی ئێمە بە گوێی سەران و گەورەکانمان کرد، ئیتر لە ڕێگای ڕاست گومڕایان کردین.

وە لە ڕکاتی دووەمدا ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا﴾. الأحزاب:٦٨

واتە: ئەی پەروەردیگار دوو بەرامبەر سزایان بدەو بەر نەفرینی گەورەی خۆتیان بخەیت.

فەرمانڕەواکە وتی: چەندی حەزت لێیە نوێژەکەت درێژ بکەرەوە وە چیت حەز لێیە بیخوێنە جگە لەم دوو ئایەتە.

* عومەری کوڕی خەتتاب بەلای هەندێك منداڵدا تێپەڕی کە یارییان دەکرد، هەموویان هەڵاتن تەنها عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر نەبێت.
عومەر وتی: بۆ لەگەڵ هاوڕێکانت ڕات نەکرد؟
وتی: هیچ تاوانێکم نەکردووە لێت ڕا بکەم نە ڕێگەش تەسکە بۆت فراوان بکەم و لەسەر ڕێگەکەت لاچم.

* چەند کەسێك خەریکی خوێندنی کتێبی بوخاری و موسلیم بوون پیاوێك هات وتی: خەڵك گەیشتە سەر مانگ ئێوە هەر لێرەن؟
وتیان: شتێکی سەیر نییە دروستکراوێك گەیشتووە بە دروستکراوێکی تر ئێمە دەمانەوێت بگەین بە دروستکار (الخالق).

* دوای ئەوەی بیل گێتس لە چێشتخانەیەك نانی خوارد، پێنج دۆلاری بەخشی بە شاگردەکە، بینی شاگردەکە سەرسامە.
وتی:چییە؟
شاگردەکە وتی: کوڕەکەت ماوەیەك لەمەوبەر لەسەر هەمان مێز دانیشت ٥٠٠ دۆلاری بەخشش دامێ، کەچی تۆ لەگەڵ ئەوەی باوکی وە دەوڵەمەندترین پیاوی جیهانی تەنها پێنج دۆلارم دەدەیتێ؟!

بیڵ گێتس زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: ئەو کوڕی دەوڵەمەندترین پیاوی جیهانە، بەڵام من کوڕی دارفرۆشێکم.

* فەرمانڕەوایەکی ستەمکار هەبوو کە زوڵمی زۆری لە خەڵك دەکرد بە شێوەیەك هەموو خەڵك ئاواتەخوازی مردنی بوون، ڕۆژێکیان لە ڕوبارێکدا خۆی دەشرد لەناکاو کەوتە ناو ڕوبارەکەو خەریك بوو بخینکێت پیاوێك کە لەوێوە تێدەپەڕی ڕزگاری کرد.
کاتێك ڕزگاری کرد و هێنایە دەرەوە فەرمانڕەواکە وتی: چیت دەوێت داوا بکە پێت دەدەم.
پیاوەکە وتی: تۆ کێیت تا هەرچیەکم بوێت پێم بدەیت؟
وتی: من فەرمانڕەوای ئەم شارەم.
پیاوەکە وتی: تەنها داوام ئەوەیە بە کەس نەڵێیت من ڕزگارم کردویت.

* پرسیار کرا لە ( ابن عثیمین ) : کاتێك یەکێك لە نزا کردن تەواو بوو دەبێ چی بکات؟
وتی: دەستەکانی دادەگرێت.

* پیاوێك هاتە لای شەعبی و پێی وت: من هاوسەرگیریم لەگەڵ ئافرەتێکدا کردووە ئێستا بۆم دەرکەوتووە کە شەلە ئایا دەتوانم لێی جیا ببمەوە.

وتی: ئەگەر دەتەوێت پێشبڕکێی ڕاکردنی پێ بکەیت بەڵێ.

* پیاوێك بە ئەبو حەنیفەی وت: ئەگەر لەناو ڕوبارێکدا مەلە بکەم پێویستە ڕوو بکەمە قیبلە یان بە پێچەوانەوە.
ئەبو حەنیفە وتی: پێویستە ڕوو بکەیتە جلەکانت بۆ ئەوەی نەدزرێن.

* حاجیەك پرسیاری کرد ئایا دەتوانم لەکاتی ئیحرامدا خۆم بخورێنم؟
وتی: بەڵێ.
وتی: تا چەند دەتوانم؟
وتی: تا ئێسکەکانت دەردەکەون.

*دڵ تەنگ بوو پێی وت: تۆ دووەمین جواترین کچیت کە بینیومە.
وتی:ئەی یەکەم کێیە؟
وتی: تۆیت کاتێك زەردەخەنەت لەسەرلێوە.

* پیاوێکی پیر کە پشتی چەمابوویەوە بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشت، گەنجێك بە گاڵتەوە پێی وت: مامە ئەو کەوانەیەی پشتت بە چەند دەفرۆشیت؟
پیاوە پیرەکە وتی: ئەگەر خوا تەمەنت درێژ بکات بەخۆڕایی بەدەستی دەهێنیت.

* پیاوێك بە پێشەوا عەلی وت: باشە بۆ ئەو فیتنەیەی لە سەردەمی تۆدا هەیە لەسەردەمی ئەبوبەکرو عومەردا نەبوو؟
پێشەوا عەلی وتی: لەبەرئەوەی ئەوان پیاوی وەك منیان لەگەڵ بوو منیش پیاوی وەك ئێوەم لەگەڵە.

* پیاوێکی بەتەمەن لەنێوان دوو گەنج دانیشتبوو کە دەیانەویست گاڵتەی پێ بکەین وتیان: خاڵە تۆ گێلیت یان نەزانیت؟
پیاوەکە وتی: لەنێوان هەردووکیاندام.

* پیاوێك بە ئیبن شوبرومەی وت: زانست لەلای ئیمەوە هات بۆ لای ئێوە.
وتی: بەڵێ بەڵام هەرگیز نەگەڕایەوە بۆ لای ئێوە.

* پیاوێك بە یەکێکی وت: شەرم ناکەیت لە بەخشینی کەم؟
وتی: نەبەخشین لەو کەمترە.

* دوو پیاو قسەیان دەکرد یەکێکی تر هات وتی: ئەوە باسی چی دەکەن دڵنیام ئەوەی دەیڵێن درۆیە.
وتیان: بە چاکە باسی تۆمان دەکرد.

* یەکێك وتی: چۆنیت؟

وتی: هەر وەك جارانم.

وتی: بۆ جاران چۆن بویت؟

وتی: هەر وەك ئێستا بووم.

* شەعبی دەڵێت: ڕۆژێك لای شورەیحی قازی دانیشتبووم ژنێك هاتە ژورەوە بە کوڵ دەگریا سکاڵای لە مێردەکەی هەبوو، وتم: پێم وایە ئەو ئافرەتە ستەمی لێ کراوە.

شورەیح وتی: چۆن دەزانیت؟

وتم: لەخۆمەوە وتم هەر لەبەر ئەوەی کە دەگرییێت.

شورەیح وتی: براکانی یوسفیش بە گریانەوە هاتنە لای باوکیان ستەمکاریش بوون.

* ئەسکەندەر لای ذوجانس وەستا بوو پێی وت: لێم ناترسیت؟

ذوجانس وتی: تۆ کەسێکی باشیت یان خراپیت؟

ئەسکەندەر وتی: کەسێکی باشم.

ذوجانس وتی: من لە کەسی باش ناترسم بەڵکو خۆشم دەوێت.

* پیاوێك بە هەژارێکی وت: ئەگەر جلەکانی منت بۆ بووبا ئەوا پێم دەدای.

هەژارەکە وتی: ئەگەر جلەکانیشت بۆ من نەبێت پارەکەت بۆ من دەبێت.

* پیاوێکی دەشتەکی لە ناوەڕاستی ڕێگایەکدا میزی دەکرد، یەکێك پێی وت: بۆ لە ناوەڕاستی ڕێگای مسوڵمانان میز دەکەیت؟
دەشتەکیەکە وتی: منیش مسوڵمانم لە بەشی خۆم لەم ڕێگایەدا میز دەکەم.

* بە ئەبو تەمام یان وت: بۆ شتێك ناڵێیت کە تێی بگەین؟
وتی: بۆ تێناگەن لە شتێك کە دەیڵێم؟

* پاشای ڕۆم بۆ پاشای فارسی نوسی: هەرچی تۆ بیڵێیت درۆیە.
ئەویش بۆی نوسی ڕاست دەکەیت. ( واتا لە بەڕاست دانانی تۆدا درۆزنم)

* کۆمەڵێك دار دانرا بوون پیاوێك هەندێك داری هەڵگرتن ویستی بیانبات لەو کاتەدا خاوەنی دارەکان هات، پیاوەکە وتی: بمبورە نەمزانی ئەو دارانە هی تۆن.
خاوەنی دارەکان وتی: باشە ئەگەر نەشت زانی بێت ئەو دارانە هی منن خۆ دەزانیت هی خۆت نین.

* مەنصور وتی: لەبەرەکەتی ئێمە لەسەر مسوڵمانان ئەوەیە کە تاعون لەسەردەمی ئێمە هەڵگیراوە لەسەریان.

ئیبن عەیاش وتی: خوا ئێوەو تاعون بەیەکەوە لەسەر ئێمە کۆ ناکاتەوە.

* وتیان کێ خراپترینی خەڵکە؟
وتی: ئەوەی پێی وایە باشترینی خەڵکە.

* حەجاج لەگەڵ پیاوێك هێلکەی کوڵاویان دەخوارد، حەجاج زەردێنەکانی دەخواردو سپیێنەکانیشی دەدا بە کابرا.
کابرا وتی: ئای هێلکەوڕۆن چەند دادپەروەرانە ترە.

* پیاوێك بە شاعیرێکی وت: لە هۆنراوەیەکدا بە چاکە باسم بکە.
شاعیرەکە وتی: چاك بە با باست بکەم.

* وتیان: تۆ کێیت؟
وتی: ئەوەم کە دەمبینن.

* پیاوێك باڵای زۆر بەرز بوو ویستی هەندێك هەنار بکڕێت بە خاوەنی هەنارەکانی وت: ئەم هەنارانە زۆر بچوکن.
خاوەنی هەنارەکان وتی: ئاخر تۆ لە ئاسمانەوە سەیریان دەکەیت هەر باشە وا نازانیت کە مازون.

* فاڵگرەوەیەك بە پیاوێکی وت: دەزانم لە داهاتودا چیت بەسەر دێت.
پیاوەکە وتی: چیم بەسەر دێت.
فاڵگرەوەکە وتی: دوو درهەمم بدەیە پێت دەڵێم.
پیاوەکە وتی: ئەگەر ڕاستت کردبا دەتزانی کە من تەنها یەك درهەمم هەیە.

* کاتێك پزیشکێکی بەناوبانگی نەشتەرگەری دڵ ئۆتۆمبێلەکەی لای فیتەر چاك دەکردەوە، فیتەرەکە مەکینەی ئۆتۆمبێلەکەی کردەوەو هەندێك شتی لێ دەردەهێناو هەندێك شتی چاك دەکردەوە لەناکاو ئاوڕی دایەوە لای پزیشکەکەو پێی وت: ڕێگە دەدەیت پرسیارێك بکەم؟
پزیشکەکە سەرسام بوو بە داواکەی و وتی: فەرموو بپرسە.
فیتەرەکە وتی: تۆ نەشتەرگەری بۆ دڵی مرۆڤەکان دەکەیت و منیش نەشتەرگەری بۆ دڵی ئۆتۆمبێلەکان دەکەم ڕێك وەك تۆ، باشە بۆچی تۆ پارەی زۆرت دەست دەکەوێت و منیش پارەی زۆر کەمتر لە تۆ؟
پزیشکەکە لە فیتەرەکە نزیك بویەوەو بە هێمنیەوە وتی: ئەگەر دەتوانیت هەوڵ بدە بێ ئەوەی ئۆتۆمبێلەکە بکوژێنیتەوە چاکی بکەوە.

* کۆمەڵێك کەس ڕێککەوتن کە جوحا لەگەڵ خۆیان ببەن بۆ حەمام و لەوێ گاڵتەی پێ بکەن و پێی پێبکەنن.

هەریەکەیان هێلکەیەکی لەگەڵ خۆی بردو کاتێك ڕۆیشتنە ناو حەمامەکە وتیان: وەرن با هێلکە بکەین وە ئەوەی نەیتوانی هێلکە بکات ئەوا دەبێت کرێی خۆشردنی هەمووان بدات.

هەریەکەیان وەك مریشك دەستی دەکرد بە گارەگارو پاشان هێلکەیەکی لەبن خۆی دەردەهێنا هەتا سەرەی جوحا هات، جوحا هەستاو وەکو کەڵەشێر دەیخوێندو بەدەوریاندا دەسوڕایەوە.

پێیان وت: ئەوە چییە جوحا بۆ وا دەکەی؟

جوحا وەڵامی دانەوە: ئایا نابێت کۆمەڵێك مریشك کەڵەشێرێکیان هەبێت؟

* ئافرەتێك بە بەشاری شاعیری نابینای وت: نازانم بۆچی خەڵك ڕێزت لێ دەگرێت سەرەڕای ناشیرینی ڕوخسارت.

بەشاری وەڵامی دایەوە: لەبەر جوانیەکەی ڕێز لە شێر ناگیرێت.

* دوو کەسی بێ دین لای پیاوێکی مسوڵمان دانیشتبوون ویستیان توڕەی بکەن، یەکێکیان چاوی لەوەی تریان نوقاند پاشان وتی: ویستم پشوەکەم لە ئەفەریقا بەسەر ببەم بەڵام کاتێك زانیم نیوەی دانیشتوانەکەی مسوڵمانە پەشیمان بومەوە.

هاوڕێکەی وتی: بۆچی ناچیت بۆ ئەورووپا؟

وتی: ئەورووپاش مسوڵمانی زۆری تێدا بڵاوبونەتەوە بە هەر شەقامێکدا بڕۆیت بە مسوڵمانێك دەگەیت دەمەوێت بچم بۆ شوێنێك هیچ مسوڵمانێکی تێدا نەبێت.

مسوڵمانەکە ئاوڕی دایەوە بۆ لایان و وتی: بۆچی بیر لە گەشتێك ناکەیتەوە بۆ دۆزەخ بیستومە تەنها شوێنێکە کە مسوڵمانی تێدا نییە.

* جارێکیان پیاوێك لەگەڵ قازی یەك کە پێدەچوو پێشبڕکێ و بەربەرەکانێ لە نێوانیاندا هەبوبێت بەلای بێستانێکدا دەڕۆیشتن کە گۆرانی بێژی ئافرەت گۆرانیان تێدا دەوت، کاتێك گۆرانی بێژەکان بێدەنگ بوون و وازیان لە گۆرانی وتن هێنا پیاوەکە وتی: بەڕاستی کارێکی باشتان کرد.

پاش ماوەیەك پیاوەکە بۆ کێشەیەك وەك شایەت چوو بۆ لای قازی یەکە.

قازی وتی: شایەدی تۆ قبوڵ نیە!

پیاوەکە وتی: بۆچی؟

قازی وتی: لەبەر ئەو قسەیەی کە ئەو ڕۆژە بە گۆرانیبێژەکانت وت (بەڕاستی کارێکی باشتان کرد).. ئەوە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ ڕازیت بە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوای باڵادەست.

پیاوەکە پرسیاری لێ کرد: کەی پێم وتن بەڕاستی کارێکی باشتان کرد، کاتێك کە گۆرانیان دەوت یان کاتێك بێدەنگ بوون و وازیان لە گۆرانی وتن هێنا؟

قازی وتی: كاتێك بێ ده‌نگ بوون و وازیان له‌ گۆرانی وتن هێنا.

پیاوه‌كه‌ وتی: ده‌ی من مه‌به‌ستم له‌ قسه‌كه‌م ئه‌وه‌ بوو كارێكی باشتان كرد كه‌ وازتان له‌ گۆرانی وتن هێناو بێده‌نگ بوون نه‌ك بۆ گۆرانی وتنه‌كه‌یان.

قازی نه‌یتوانی هیچ بكات و ناچار بوو شایه‌تیه‌كه‌ی وه‌ربگرێت.

* پیاوێك ڕۆیشته‌ لای فه‌رمانڕه‌وایه‌ك، فه‌رمانڕه‌واكه‌ وتی: چیت ئاماده‌ كردووه‌ بۆزستان له‌به‌ری بكه‌یت؟

پیاوه‌كه‌ وتی: ئه‌وه‌ی تۆ ده‌مده‌یتێ.

فه‌رمانڕه‌وا فه‌رمانی كرد جلێكی باشی بۆ بێنن.

* به‌ یوسف پێغه‌مبه‌ریان وت (سه‌لامی خوای لێ بێت): بۆچی خۆت برسی ده‌كه‌یت له‌ كاتێكدا خه‌زێنه‌كانی دونیا له‌به‌رده‌ستی تۆدان؟

وتی: له‌به‌رئه‌وه‌ی ده‌ترسم تێر بم هه‌ژاره‌كانم بیر بچێته‌وه‌.

* پاشایه‌ك وتی: پاشایه‌تی چه‌ند خۆشه‌ به‌ڵام خۆزگه‌ تا هه‌تایه‌ به‌رده‌وام ده‌بوو.

یه‌كێك وتی: ئه‌گه‌ر تا هه‌تایه‌ به‌رده‌وام بوایه‌ ئه‌وا نه‌ده‌گه‌یشت به‌ تۆ.

* پیاوێکی کورتە باڵا هاتە لای کیسرا و هاواری دەکرد من ستەم لێ کراوم، یەکێك وتی: دادوەری بۆ ئەم کورتە باڵایە بکە.
وتی: باوەڕناکەم کەس ستەم لە کورتە باڵا بکات.
کورتە باڵاکە وتی: ئەوەی ستەمی لێ کردووم لە خۆم باڵای کورتترە.
پێکەنی و فەرمانی کرد دادوەری بکرێت.

* پیاوێك هاتە لای خەلیفە مەئمون وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران من پیاوێکی عەرەبم.
مەئمون وتی: ئەوە هیچی سەرسوڕهێنەری تێدا نییە.
پیاوەکە وتی: من دەمەوێت حەج بکەم.
مەئمون وتی: ئەوە ڕێگەیە فەرموو.
پیاوەکە وتی: ئاخر پارەم نیە.
مەئمون وتی: کەواتە حەجت لەسەر نیە.
پیاوەکە وتی: من بۆ ئەوە هاتووم یارمەتیم بدەیت نەك فەتوام بۆ بدەیت.
ئەویش یارمەتی دا.

* سۆفیەك هەندێك گەنمی برد بۆ ئاش بۆ ئەوەی بیهاڕێت، ئاشەوانەکە وتی: من سەرقاڵم کاتم نیە ناتوانم بۆتی بهاڕم.
سۆفیەکە وتی: بۆم بهاڕە دەنا نزا لە خۆت و لە ئاشەکەت دەکەم.
ئاشەوانەکە وتی: بۆ نزاکانی تۆ گیرا دەبن؟

سۆفیه‌كه‌ وتی: به‌ڵێ.

ئاشه‌وانه‌كه‌ وتی: ده‌ی نزا بكه‌ كه‌ خوا گه‌نمه‌كه‌ت بۆ بكات به‌ ئارد، ئه‌مه‌ سودی زیاتره‌ بۆ تۆ.

* شیعه‌یه‌ك به‌ پیاوێكی سونه‌ی وت: تۆ ڕقت له‌ منه‌ له‌ كاتێكدا نوێژه‌كه‌ت قبولْ نیه‌ تا صه‌له‌وات له‌سه‌ر من لێنه‌ده‌یت و نه‌ڵێیت (اللهم صل على محمد وعلى آله) .

پیاوه‌كه‌ وتی: ئه‌گه‌ر بڵێم ( آله الطيبين) ئه‌وا تۆی لێ ده‌چێته‌ ده‌ره‌وه‌.

* پیاوێك كه‌رێكی پێ بوو تازه‌ كڕی بووی، دراوسێكه‌ی كه‌ چاوێكی كوێر بوو پرسیاری لێ كرد ئه‌م كه‌ره‌ت به‌ چه‌ند كڕیوه‌.

وتی: چه‌ند باشه‌؟

وتی: په‌نجا دینار.

پیاوه‌كه‌ به‌ سه‌د دینار كڕی بووی وتی: سبحان الله یه‌ك دینارت هه‌ڵه‌ نه‌كرد به‌ سه‌د دینار كڕیومه‌ تۆ یه‌كسه‌ر نیوه‌كه‌ت بینی.

* قوڕه‌یشیه‌كان هاتنه‌ لای ئه‌بو طالیب وتیان: موحه‌مه‌د بده‌ به‌ ئێمه‌ بیكوژین ئێمه‌ش عه‌ماره‌ ده‌ده‌ین به‌ تۆ ببێت به‌ كوڕت له‌ جێگه‌ی ئه‌و.

ئه‌بو طالیب وتی: كوڕه‌كه‌متان بده‌مێ بیكوژن و كوڕه‌كه‌ی ئێوه‌ وه‌ربگرم خواردنی بده‌مێ بۆتان.

* ئیبن جەوزی عادەتی وا بوو کەلەسەر کورسی وتار خوێندنەکەی هاتبایە خوارەوە وەڵامی کەسی نەدەدایەوە، ڕۆژێکیان پرسیاریان لێ کرد:ئایا کامیان باشترەو پلەی بەرزترە ئەبوبەکر یان عەلی؟

ئیبن جەوزی ترسا لەوەی فیتنە لەنێوان سونەو شیعەکان دروست ببێت ئەگەر یەکێکیان هەڵبژێرێت بۆیە وتی: ئەوەی کچەکەی خواست، پاشان یەکسەر لەسەر کورسیەکەی هاتە خوارەوە.

وەڵامەکەی دوو واتای هەڵدەگرت، یەکەمیان ئەوەی کە عەلی کچەکەی پێغەمبەری خواست (صلى الله عليه وسلم) دوەمیشیان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کچەکەی ئەبوبەکری خواست.

* دەشتەکییەك براکەی مرد، پرسیاریان لێ کرد هۆکاری مردنەکەی چی بوو؟

وتی: بوونی.

* سواڵکەرێك لە دەرگای ماڵێکی دا، خاوەن ماڵەکە وتی: کەسی لێ نییە. سواڵکەرەکە وتی: تۆ کەسێکی ئەگەر خوا بەرەکەتی تێ خستبی.

* پیاوێکی ڕیشدار منداڵەکەی خۆی هەڵگرتبوو کە بە دەنگی بەرز دەگریا، پیاوێکی بێ ڕیش کاریگەر بوو بە گریانەکەی ڕۆیشت منداڵەکەی

لەپیاوەکە وەرگرت و منداڵەکە بێ دەنگ بوو، پیاوە بێ ڕیشەکە وتی: ئێوەی ڕیشدار ترسناکن تەنانەت منداڵیش لێتان دەترسێت، سەیرکە چۆن لای من بێدەنگ بوو.

پیاوە ڕیشدارەکە وتی: بۆیە لای تۆ بێدەنگ بوو چونکە وای زانی کە دایکی ئەویت.

* یەکێك پرسیاری لە ئیبن خەراط کرد: وشەی کەموج بە مانای چی دێت؟

ئیبن خەراط سەری سوڕما لەبەرئەوەی لە ژیانی دا ئەم وشەیەی نەبیستبوو بۆیە پرسیاری لە پیاوەکە کرد: ئەم وشەیەت لە کوێ بینیوە؟

پیاوەکە زۆر بە متمانەوە وتی: لەو شیعرەی ( امرؤ القیس) کە دەڵێت "وَلَيلٍ كَـموجِ البَحرِ أَرخى سُدُولَهُ"

ئیبن خەراط وتی: کەموج زیندەوەرێکە دەخوێنێتەوەو تێ ناگات.

* دەڵێن عەنتەرە پیاوێکی زۆر ئازا بوو ڕۆژێکیان گایەك بەدوای کەوت و ئەویش ڕای کرد، پرسیاریان لێ کرد: ئایا لە گایەك دەترسیت لە کاتێکدا تۆ عەنتەرەی پاڵەوانیت.. ئەی کوا ئازایەتییەکەت؟

ئەویش وەڵامی دانەوەو وتی: ئاخر گایەکە نازانێت من عەنتەرەم.

* ئه‌بو ئه‌سوه‌د دراوسێیه‌كی هه‌بوو زۆر ئازاری ده‌داو شه‌وانه‌ به‌ردی ده‌گرته‌ ماڵه‌كه‌ی و بۆ به‌یانیش بڵاوی ده‌كرده‌وه‌ ده‌یوت خوا به‌رد بارانی كردووه‌، ئه‌ویش ده‌یوت: درۆ ده‌كه‌ی ئه‌گه‌ر خوا به‌رد بارانی كردبام به‌ردێكم پێ ده‌كه‌وت.. پاشان خانوه‌كه‌ی فرۆشت، پرسیاریان لێ كرد: خانوه‌كه‌ت فرۆشت؟

وتی: نه‌خێر دراوسێكه‌مم فرۆشت.

* پیاوێكی مسوڵمان له‌سه‌ر مه‌غسه‌له‌یه‌ك ده‌ستنوێژی ده‌گرت، پیاوێكی بێ دین هاواری كرد چۆن قاچت له‌سه‌ر مه‌غسه‌له‌ ده‌شۆیت؟

پیاوه‌كه‌ وتی: تۆ رۆژی چه‌ند جار ده‌م و چاوت ده‌شۆیت؟

وتی: رۆژی جارێك كه‌ له‌خه‌و هه‌ڵده‌ستم.

مسوڵمانه‌كه‌ وتی: ده‌ی من رۆژی به‌لایه‌نی كه‌مه‌وه‌ پێنج جار قاچم ده‌شۆم، بۆ خۆت دادوه‌ر به‌ قاچی من خاوێنتره‌ یان ده‌م و چاوی تۆ؟!

* نه‌صری كوڕی یه‌سار بینی پیاوێكی ده‌شته‌كی زۆر به‌ تامه‌زرۆییه‌وه‌ نان ده‌خوات، پرسیاری لێ كرد: ئه‌ی پیاوی ده‌شته‌كی تا ئێستا تێر نانت خواردووه‌؟

وتی: له‌ ماڵی تۆو باوكی تۆ نه‌خێر.

نصر زۆر ته‌ریق بوویه‌وه‌ وتی: خۆزگه‌ لاڵ ده‌بووم به‌س ئه‌و پرسیاره‌م نه‌ده‌كرد.

* پیاوێك بە مەجوسیەکی وت: تۆ باوکی کێی؟
مەجوسیەکە وتی: ئێمە لەوە گەورەترین بدرێینە پاڵ منداڵەکانمان بەڵکو دەدرێینە پاڵ باوکانمان.
پیاوەکە وتی: منداڵەکانمان کردەوەی خۆمانن وە باوکانمان کردەوەی کەسانی ترن ئەگەر بدرێینە پاڵ کردەوەکانی خۆمان باشترە لەوەی بدرێینە پاڵ کردەوەی کەسانی تر.

* پرسیار کرا لە شەعبی دەربارەی شتێك وتی: نازانم.
پێیان وت: شەرم ناکەیت دەڵێیت نازانم لە کاتێکدا تۆ زانای عێراقیت؟
وتی: فریشتەکان شەرمیان نەکرد کاتێك وتیان: ﴿سُبحانَكَ لا عِلمَ لَنا إلّا ما عَلَّمتَنا﴾

* پیاوێك لە یەمامەوە هاتبوو پێیان وت: باشترین شتێك کە بینیبێتت تێیدا چی بوو؟
وتی: هاتنە دەرەوەم لەوێ باشترین شتێکە کە بینیبێتم تێیدا.

* فەرەزدەق سواری وڵاخێك بوو بوو بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕی کاتێك گەیشتە لای ئافرەتەکە وڵاخەکەی ترێکی لێ بەربوو ئافرەتەکە پێکەنی، فەرەزدەق ئاوڕی دایەوە بۆ لای ئافرەتەکەو وتی: بەچی پێدەکەنیت..

سوێند بەخوا تا ئێستا هیچ مێینەیەك هەڵی نەگرتووم ئیلا ترپێکی لێ بەربووە.

ئافرەتەکە وتی: دایکت نۆ مانگ هەڵی گرتوی ئەی کوڕی ترکەنەکە.

* پرسیار لە ئیبن عومەر کرا ئایا پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لە نوێژدا ئاوڕی دەدایەوە؟

وتی: نەخێر نە لە نوێژدا نە لە غەیری نوێژدا.

* کۆمەڵێك کەس باسی خراپی حەجاجیان دەکرد کە چەند کەسێکی خراپ و خوێنرێژ بووە، یەکێك وتی: تەڵاقم کەوتبێت خوا لە حەجاج خۆش نابێت.

وتیان: چۆن تەڵاق لەسەر شتێکی نادیار دەخۆیت تەڵاقت دەکەوێت پێویستە لە خێزانەکەت دوور بکەویتەوە.

یەکێك وتی: کێشەت نییە ئەگەر خوا لەو هەموو تاوانەی حەجاج خۆش بێت لەو تاوانەی تۆش خۆش دەبێت، تاوانەکەی تۆ لەچاو تاوانەکانی ئەودا زۆر بچوکە.

* ڕۆژێکیان حەجاج بینی لەسەر مینبەرەکەی نوسراوە: ﴿قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلاً إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ﴾ الزمر:٨.

واتە: بڵێ کەمێك بە خوانەناسی ڕابوێرە، بەڵام دڵنیابە کە تۆ نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخیت.

ئەویش لە ژێرەوە نوسی: ﴿ قُلْ مُوتُوا بِغَيْظِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴾ آل عمران:١١٩.

واتە: بڵێ بمرن بەداخ و ڕقی خۆتانەوە بەڕاستی خوا زانایە بەوەی لەناو دڵەکاندایە.

* پیاوێك دەڵێت ئیبڕاهیمی کوڕی ئەدهەم وتی: هەواڵم پێ بدە دەربارەی ئەوەی تێیدایت.

وتم: ئەگەر ڕزق و ڕۆزیم هەبوو دەیخۆم وە ئەگەر نەمبوو ئەوا ئارام دەگرم.

وتی: سەگەکانی بەڵخیش وا دەکەن.

وتم: تۆ چی دەکەیت؟

وتی: ئەگەر ڕزق و ڕۆزیم هەبوو ئەوا لێی دەبەخشم وە ئەگەر نەمبوو ئەوا سوپاسی خوا دەکەم.

* پرسیار کرا لە شەعبی: ئایا گۆشتی مێش حەڵاڵە؟

وتی: ئەگەر حەزت بۆی چوو بیخۆ.

* پیاوێك بە ناوی خۆی بانگی فەرمانڕەوایەکی کرد ئەویش تورە بوو وتی: بۆ بە کونیەکەم بانگم ناکەی ناڵێیت ئەبو فلان؟
پیاوەکە وتی: خوای باڵادەست خۆشەویسترین دروسکراوی خۆی بە ناوی خۆیەوە بانگ کرد کە فەرمووی: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلا رَسُولٌ﴾ وە خراپترینی خەڵکی بە کونیەکەی بانگ کرد کە فەرموی:﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾.

* قەشەیەك پرسیاری لە خالیدی کوڕی یەزید کرد: تۆ مسوڵمانیت؟
خالید وتی: بەڵێ.
قەشەکە وتی: لە زاناکانیانی یان لە نەزانەکانیان؟
خالید وتی: نە لە زاناکانیانم وەنە لە نەزانەکانیشیانم.
قەشەکە وتی: ئێوە دەڵێن بەهەشتیەکان دەخۆن و دەخۆنەوەو میزو پیسایش ناکەن شتی وا چۆن دەبێت؟!
خالید وتی: بەڵێ وا دەڵێین و هەر بەم شێوەیەشە، ئەوە وەکو نمونەی منداڵێك وایە کە لە سکی دایکی دایەو بەردەوام لە ڕزقی خوای بۆ دێت لە خواردن و خواردنەوە میزو پیساییش ناکات..قەشەکە زۆر سەرسام بوو بە وەڵامەکەی پاشان وتی: ئەی ئێوە دەڵێن بەردەوام لە خواردن و خواردنەوەی بەهەشت دەخۆین و هیچیشی لێ کەم ناکات؟!
خالید وتی : بەڵێ وا دەڵێین و هەر بەم شێوەیەشە، ئەوە وەکو نمونەی پیاوێکە کە خوا زانست و زانیاری پێ دابێت لە دونیادا، ئەگەر هەموو

خەڵکی دونیا زانست و زانیاری لێ وەربگرن هیچ شتێك لە زانست و زانیاریەکەی ئەو کەم ناکات.

قەشەکە زۆر سەرسام بوو بە وەڵامەکەی پاشان وتی: ئایا تۆ نەتوت من نە لە زاناکانیانم وەنە لە نەزانەکانیشیانم.

خالید وتی: بەڵێ نە لە زاناکانیانم وەنە لە نەزانەکانیشیانم.

قەشەکە وتی: تا ئێستا کەسم لە تۆ زاناترم نەبینیوە.

* پیاوێك هاتە لای شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەیوت عیلمی غەیب دەزانم، داوای لە شێخ کرد وتووێژی لەگەڵ بکات.

شێخ وتی: بەیەك مەرج وتووێژت لەگەڵدا دەکەم.

پیاوەکە وتی: مەرجەکەت چیە؟

شێخ وتی: چۆن دەڵێیت غەیب دەزانم کەچی مەرجەکەی من نازانیت؟!

بەمە وتووێژەکە کۆتایی هات.

* ئافرەتێکی جوان و ڕازاوە بە پۆزەوە بە گەنجێکی بڕواداری وت: بۆچی تۆ گرنگی بە من نادەیت؟

گەنجێکم نەبینی ئیلا بەرامبەرم سەری دانەواندووە.

گەنجە بڕوادارەکە وەڵامی دایەوە وتی: ئەگەر یەکێك جارێك خۆی بۆ دانەواندی مانای ئەوە نیە کە تۆ کەسێکی گرنگ و پیرۆزیت، من هەموو

بەیانیەك دوای نان خواردن جلەکانم لەبەر دەکەم پاشان خۆم دادەنەوێنم بۆ ئەوەی پێڵاوەکانم لەبەر بکەم.

* حەجاج بە پیاوێکی وت: بەخوا ڕقم لێتە.
پیاوەکە وتی: خوا ئەوەمان بخاتە بەهەشتەوە کە زیاتر ڕقی لەوەی ترە.

* پیاوێك پرسیاری لە شەعبی کرد: ئایا سەلام لە کۆمەڵێك بکەم کاتێك خەریکی نان خواردنن؟
وتی: ئەگەر ویستت نانیان لەگەڵ بخۆیت بەڵێ.

* پیاوێکی زۆر ناشیرین خێزانەکەی دووگیان بوو، خێزانەکەی پێی وت: وەی لە حاڵت ئەگەر منداڵەکەمان لەتۆ بچێت.
پیاوەکە وتی: وەی لە حاڵت ئەگەر لە من نەچێت.

* پیاوێکی دەشتەکی نوێژی زۆر کورت کردەوە، فەرمانڕەوایەك گۆچانی لێ ڕاست کردو وتی: نوێژەکەت دووبارە بکەوە.
دوای ئەوەی نوێژەکەی بە هێمنی و لەسەرخۆیی دووبارە کردەوە فەرمانڕەواکە وتی: ئەم نوێژە باشتر بوو یان ئەوەی پێشتر کردت؟
دەشتەکیەکە وتی: ئەوەی پێشتر کردم.
فەرمانڕەواکە وتی: بۆچی؟

دەشتەکیەکە وتی: لەبەرئەوەی نوێژی یەکەمم بۆ خوا کرد بەڵام ئەوەی دووەمم لە ترسی گۆچانەکەی تۆ کرد.

* کاتێك حمادە کچی مامی مەنصور کۆچی دوایی کرد، مەنصور لەکاتی ناشتنەکەیدا ئامادە بوو، کاتێك لەسەر گۆڕەکە وەستا بوون پێش ئەوەی مردووەکە بنێژن بە ئەبو دولامەی وت: چیت بۆ ئەم گۆڕە ئامادە کردووە؟ وتی: (حمادە)ی کچی مامت ئەی پێشەوای باوەڕداران.
مەنصور ئەوەندە پێکەنی کە ناچار بوو دەم و چاوی داپۆشی.

* پیاوێك ویستی گاڵتە بە پەهلول بکات وتی: ئەی پەهلول تۆ ئێستا هەر لێرەی برۆ فەرمانڕەوا دوو درهەم دەدات بە هەموو شێتەکان .
پەهلول وتی: دە تۆ دوو درهەمەکەی خۆت بدە بە من.

* فەرمانڕەوایەك بە پیاوێکی هەژاری وت: حاڵت چۆنە؟
هەژارەکە وتی: تۆ حاڵی ئێمەیت، سەیر بکە بزانە تۆ چۆنیت بۆ ئێمە.
فەرمانڕەواکە فەرمانی کرد پارەیەکی باشی پێ بدەن.

* دەشتەکییەك بە پیاوێکی وت: بیست درهەمم بە قەرز بدەیە بۆ ماوەی مانگێك.

پیاوەکە وتی: جا مانگێك چیە تۆ بڵێ بۆ ماوەی ساڵێك، بەڵام بەخوا پارەم نییە.

* لە کۆندا خەڵك بە کۆمەڵ لە حەمام خۆیان دەشرد، پیاوێکی شێت بە ڕوتی کە هیچ جلێکی لەبەر نەبوو هاتە ناو حەمامەکە، پیاوێك کە لەناو حەمامەکە بوو چاوی نوقاند.

شێتەکە وتی: ئەوە لە کەیەوە چاوت کوێر بووە؟

پیاوەکە وتی: لەو کاتەوەی عەورەتی تۆ دەرکەوتووە.

* پیاوێك پرسیاری لە دەریاوانێك کرد: باوکت لەکوێ مرد؟

وتی: لەناو دەریا.

پاشان پرسیاری لێ کرد: ئەی باپیرت لەکوێ مرد؟

وتی: لەناو دەریا.

پیاوەکە بەسەرسوڕمانەوە هاواری کرد: سەرەڕای ئەوەش تۆ هەر دەریاوانی دەکەیت؟!

دەریاوانەکە زەردەخەنەیەکی کردو هەمان پرسیاری ئاراستەی پیاوەکە کردنەوەو پێی وت: باوکت لەکوێ مرد؟

وتی: لەسەر جێگە.

پاشان پرسیاری لێ کرد: ئەی باپیرت لەکوێ مرد؟

وتی: لەسەر جێگە.

دەریاوانەکە بەرەو لای بەلەمەکەی ڕۆیشت و وتی: لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەسەر جێگەکەت دەخەویت؟!

* ڕۆژێك ئەصمەعی منداڵێکی بینی ویستی کەمێك گاڵتەی لەگەڵ بکات پێی وت: کورم حەز دەکەیت سەد هەزار دیناری زێڕت هەبێت بەڵام گێل بیت؟

منداڵەکە وتی: نەبەخوا حەز ناکەم.

وتی: بۆچی؟

منداڵەکە وتی: لەبەرئەوەی دەترسم بەهۆی ئەم گێلیەوە کارێکی وا بکەم کە هەموو پارەکەم لەدەست بدەم و تەنها گێلیەکەم بۆ بمێنێتەوە.

ئەصمەعی زۆر سەرسام بوو بە زیرەکی ئەم منداڵەو پاشان ڕۆیشت.

* جاحظ لە یەکێك لە دوکانەکانی بەغدا بە ئافرەتێکی ناشیرین گەیشت، سەیرێکی کردو وتی: ﴿ وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾.

ئافرەتەکەش سەیری کردو وتی: ﴿وضَرَبَ لَنا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَه﴾.

* یەکێك بە شێتێکی وت: تۆ ئاقڵتری یان کەر؟

وتی: لەوانەیە تۆ.

* پیاوێك بە خێزانەکەی وت: خوا هیچ شتێکی دروست نەکردووە لە تۆ خۆشەویستر بێت لام.
ئافرەتەکەش وتی: وە هیچ شتێکیشی دروست نەکردووە لە تۆ زیاتر ڕقم لێی بێت.
پیاوەکە وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەوەی پێ بەخشیم کە حەزم لێیەتی وە توشی ئەوەی کردی کە ڕقت لێیەتی.

* ئافرەتێك لای پیاوێك خۆی هەڵدەکێشا بەوەی کە خەڵك زۆر پێی سەرسامە ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی بێزاری بکەن.
پیاوەکە وتی: بە ئاسانی دەتوانی لە خۆتیان دوور بخەیتەوە، تەنها بەوەی قسە بکەیت لایان.

* نوسەرێك بە بەرنادشۆی نوسەری بەناوبانگی وت: من باشترم لە تۆ، تۆ لەپێناوی پارەدا دەنوسیت، منیش لە پێناوی شەرەفدا.
یەکسەر وەڵامی دایەوە: ڕاست دەکەیت، هەریەك لە ئێمە بۆ ئەو شتە دەنوسین کە نیمانە.

* پرسیار کرا لە شەعبی: خێزانی شەیتان ناوی چییە؟
وتی: ئەو هاوسەرگیریەمان نەبینیوە.

* پیاوێك پرسیاری لە یەكێك كرد: كامە ڕێگەی كەرەكانە؟
وتی: كام ڕێگەیەت حەز لێیە لەوێوە بڕۆ.

* یەكێك پرسیاری لە یوسفی كوڕی ئەسباط كرد: چۆن بتوانم كەسێكی خۆبەكەمزان بم؟
وتی: بەهەر كەسێك گەیشتیت وابزانە چاكەی بەسەرتەوە هەیە.

* بە پیاوێكیان وت كە هەر لە زگماكەوە نابینا بوو: بۆچی نابیناكان زیرەكترو هۆشیار ترن لە چاوساغان؟
وتی: لەبەرئەوەی چاویان گواستراوەتەوە بۆ ناو دڵیان.

* ئافرەتێكی خواناس نینۆكێكی شكا پێیان وت: ئایا هەست بە ئازار ناكەیت؟
وتی: تامی پاداشتەكەی تاڵی ئازارەكەی لە دڵمدا لابرد.

* یەكێك پرسیاری لە ئەحنەفی كوڕی قەیس كرد: بەچی بووی بە گەورەی هۆزەكەت.. نە ئازاترینیانی وە نە دەوڵەمەندترینیانی وە نە بەخشندەترینیانی وە نە جوانترینیشیانی؟
ئەحنەف وەڵامی دایەوەو وتی: من گەورەی هۆزەكەمم لەبەرئەوەی تەواو پێچەوانەی تۆم؟

وتی: چۆن پێچەوانەی منی؟

ئەحنەف وتی: واز لەو شتە دەهێنم کە پەیوەندی بە منەوە نییە.. پێچەوانەی تۆ کە خۆت لە کاری من هەڵدەقورتێنی کە پەیوەندی بە تۆوە نییە.

* بە پیاوێکیان وت: ئێوە بە گۆشتاو دەڵێن چی؟

وتی: (سخین) واتا:گەرم.

وتیان: ئەی ئەگەر سارد بوویەوە؟

وتی: لای ئێمە سارد نابێتەوە.

* لە لوقمانی حەکیمیان پرسی: ئەم داناییەت لە کێ فێر بوویت؟

وتی: لە نەزانەکان، هەر عەیبێکم لێ بینی بن لێی دوور کەوتومەتەوە.

* لە دانایەکیان پرسی: ئایا هیچ شتێك هەیە لە دینارو درهەم باشتر بێت؟

وتی: بەڵێ ئەوەی دەیبەخشێت.

* بە ئیمام ئەحمەدیان وت: کەی بەندە تامی ئاسودەیی دەکات؟

وتی: کاتێك پێی خستە ناو بەهەشت.

* مەڕوان بە پیاوێکی وت: گومان دەبەم تۆ گەمژە بیت.

پیاوەکە وتی: گەمژە پیاوێکە کار بە گومانەکەی بکات.

* ڕۆژێکیان خەلیفە موعتەصیم لەگەڵ هەندێك لە ڕاوچیەکان ڕۆیشتە دەرەوەو چاویان بە شێرێك کەوت، خەلیفە سەرسام بوو بە بەژن و باڵاو شمشێری یەکێك لە پیاوەکانی پێی وت: ئەی پیاو ئایا خێرت تێدایە؟
پیاوەکە زانی کە دەیەوێت لەگەڵ شێرەکە ڕووبەڕوی بکاتەوە وتی: نەخێر ئەی پێشەوای باوەڕداران.
خەلیفە پێکەنی و وتی: ڕووی ڕەش بێت پیاوی ترسنۆك.

* پیاوێك ناوی مەزید بوو شتێکی لەبن باخەڵی نابوو پێیان وت: ئەوە چیە لەژێر باخەڵتە؟
وتی: بۆچی خستومەتە ژێر باخەڵم؟

* ئەصمەعی دەڵێت پەهلولم بینی کە یەکێك بوو لە شێتەکانی کوفە هەندێك شیرینی پێ بوو پێم وت: ئەوە چیە پێتە؟
وتی: شیرینیە.
وتم: بەشم بدە.
وتی: هی خۆم نیە.
وتم: هی کێیە؟
وتی: هی کوڕی ڕەشیدە داویەتی بە من بۆ ئەوەی بۆی بخۆم.

* پیاوێك بەدوای ئیمامی شەعبی دا دەگەڕا پرسیاری لە چەند كەسێك كرد وتیان: ئەوەیە كە لەگەڵ خێزانەكەی لەوێ دانیشتووە، پیاوەكە ڕۆیشتە لایان و سەلامی لێ كردن پاشان وتی: كامەتان ئیمامی شەعبی یە؟

شەعبی وتی: ئەوەیان (ئاماژەی بە خێزانەكەی كرد).

* دەشتەكیەك لەسەر خوانی یەزیدی كوڕی مەزید ئامادە بوو، یەزید بە هاوەڵەكانی وت: جێگە بۆ براكەتان بكەنەوە.

پیاوەكە وتی: پێویست ناكات خۆتان تێك بدەن قۆڵەكانم درێژن دەستم پێی دەگات.

كاتێك دەستی درێژ كرد تڕێكی لێ بەربوو، یەزید پێكەنی و وتی: ئەی برای عەرەب وابزانم یەكێك لە قۆڵەكانت پچڕا.

* ڕۆژێكیان حەجاج بە تەنها ڕۆیشتە دەرەوەو لە شوێنێك دانیشت، پیاوێكی پیر هاتە لای و حەجاج پێی وت: لە كوێوە هاتویت ئەی پیاو؟

پیاوەكە وتی: لەو گوندەوە.

حەجاج وتی: ڕات چۆنە بەرامبەر بە حەجاج؟

پیاوەكە وتی: خوا لەناوی بەرێت هیچ كەسێكی لەو خراپتر حوكمی عێراقی نەكردووە.

حه‌جاج وتی: ده‌زانیت من كێم؟

پیاوه‌كه‌ وتی: نه‌خێر.

حه‌جاج وتی: من حه‌جاجم.

پیاوه‌كه‌ وتی: گیانم فیدات بێت، ئه‌ی تۆ ده‌زانیت من كێم؟

حه‌جاج وتی: نه‌خێر.

پیاوه‌كه‌ وتی: من شێتێكی هۆزی عیجلم ڕۆژی دوو جار توشی په‌ركه‌م ده‌بم.

حه‌جاج پێكه‌نی و بڕیاریدا خه‌ڵات بكرێت.

* گه‌وره‌یه‌كی به‌صره‌ ویستی خانوه‌كه‌ی تێك بدات و خانوێكی گه‌وره‌ترو باشتر دروست بكات، له‌ ته‌نیشتیه‌وه‌ خانوێك هه‌بوو كه‌ هی پیره‌ژنه‌یه‌ك بوو ویستی لێی بكڕێت و له‌گه‌ڵ خانوه‌كه‌ی خۆی تێكه‌ڵی بكات، خانوه‌كه‌ بیست دیاری ده‌كرد به‌ڵام ئه‌و دووسه‌د دیناری دا به‌ پیره‌ژنه‌كه‌ به‌ڵام ڕازی نه‌بوو بیفرۆشێت.

وتیان: حه‌ق وایه‌ زیندانی بكرێیت له‌به‌ر گه‌مژه‌ییه‌كه‌ت له‌به‌رئه‌وه‌ی دووسه‌د دینارت له‌ده‌ست خۆتدا به‌رامبه‌ر به‌ خانوویه‌ك كه‌ بایی بیست دیناره‌.

پیره‌ژنه‌كه‌ وتی: حه‌ق وایه‌ ئه‌و پیاوه‌ زیندانی بكرێت كه‌ خانوویه‌ك به‌ دووسه‌د دینار ده‌كڕێت كه‌ بایی بیست دیناره‌.

به‌م قسه‌یه‌ هه‌موانی بێده‌نگ كرد.

* پیاوێك كوڕێكی زۆر ناشیرینی هەبوو داوای ژنی بۆ كرد، كوڕەكە بە باوكی وت: وابزانم ئەو كچە چاوێكی كوێرە.
پیاوەكە وتی: حەزم دەكرد هەردوو چاوی كوێر بووناية بۆ ئەوەی ڕوخساری ناشیرینی تۆ نەبینێت.

* شاعیرێك شعرێكی لای چەند كەسێك خوێندەوە، پیاوێكی حەسود باسی جوانیەكانی شعرەكەی نەكرد بەڵكو ڕەخنەی لە دێڕێكی شعرەكە گرت.
شاعیرەكە وتی: دەزانی وەك مێشولە دەتبینم واز لە ئەندامە ساغەكان دێنێت و دەگەڕێیت بۆ ئەوەی بزانیت لە كوێ برینێك هەیە لەوێ بنیشیت.

* پیاوێك كە تازە باوكی مردبوو بە زیادی كوڕی ئەبو سوفیانی وت: ئەی فەرمانڕەوا باوكمان مردووەو براكەمان دەستی بەسەر میراتەكەماندا گرتووە كە لە باوكمانەوە بۆما جێماوە.
زیاد وتی: وا دیارە كە تۆ هیچ شتێكت لەدەست نەداوە بۆی بە پەرۆش بیت زیاتر لە میراتی باوكت، خوا بەزەیی بە باوكتدا نەیەتەوە كە كوڕی وەك تۆی لە دوای خۆی جێهێشتووە.

* یەزیدی کوڕی مەنصور ڕۆیشتە لای مەهدی کە بەشاری شاعیری نابینای لا بوو.. بەشار هۆنراوەیەکی بەسەردا مەهدیدا خوێندەوە کە هەمووی مەدح و ستایشی ئەو بوو، کاتێك هۆنراوەکەی خوێندنەوە یەزید بە بەشاری وت: ئەی شێخ ئیشت چییە؟

وتی: ئیشی مرواری کون کردن دەکەم.

مەهدی پێکەنی و پاشان وتی: وەی لە حاڵت گاڵتە بە خاڵم دەکەیت؟

بەشار وتی: چی لێ بکەم پیاوێکی پیری نابینا دەبینێت هۆنراوە بەسەر خەلیفەدا دەخوێنێتەوەو مەدح و ستایشی دەکات ئەویش پرسیاری لێ دەکات ئیشت چییە!

* پیاوێك بە ڕەزیلێکی وت: بۆچی بانگم ناکەیت بۆ ئەوەی نانت لەگەڵ بخۆم؟

ڕەزیلەکە وتی: لەبەرئەوەی تۆ زۆر خێرایت لە نان خواردن وە بەخێرایی پاروەکانت قوت دەدەیت، پاروێك قوت نادەی خێرا دانەیەکی تر ئامادە دەکەیت.

پیاوەکە وتی: ئەی دەتەوێت ئەگەر نانم لا خواردیت لە نێوان هەر دوو پارودا دوو ڕکات نوێژ بکەم؟

* ڕۆژێکیان ڕەشید بانگی پەهلولی کرد بۆ ئەوەی بە قسەکانی پێبکەنێت، کاتێك پەهلول هات ڕەشید وتی: خواردنی بۆ بێنن، ئەوانیش تەنها نانیان

بۆ هێنا.. پەهلول بەڕاکردن بەرەو دەرەوە ڕۆیشت، ڕەشید وتی: بۆ کوێ؟

پەهلول وتی: جەژنی قوربان دێمەوە لاتان بەڵکو گۆشتتان هەبێت.

* پیاوێك لەهەر شوێنێك بیزانیایە دەعوەتێك هەیە دەچوو بێ ئەوەی بانگی بکەن، ڕۆژێکیان بینی کۆمەڵێك کەس جلی جوانیان لەبەر کردوەو بەیەکەوە دەڕۆن، دڵنیا بوو کە بۆ دەعوەت دەچن بۆیە هەستاو بە دوایان کەوت، دوایی بۆی دەرکەوت کە ئەوانە شاعیرن و ڕۆیشتنە لای فەرمانڕەواو هەریەکەیان هۆنراوەیەکی خوێندەوەو خەڵاتێکی وەرگرت.. کاتێك هەموان هۆنراوەکەیان خوێندەوەو خەڵاتیان وەرگرت تەنها ئەو مابوو کە بەبێ دەنگی دانیشتبوو، پێیان وت: دەی تۆش هۆنراوەکەت بخوێنەوە.

وتی: من شاعیر نیم.

وتیان: ئەی تۆ کێیت؟

وتی: من یەکێکم لە غاوون (واتا:سەرلێشێواو )، ئەوانەی دوای شاعیرەکان دەکەون کە خوای باڵادەست دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿ وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ﴾ واتە: سەرگەردان و سەرلێشێواوەکانیش شوێنی شاعیران دەکەون.

فەرمانڕەوا پێکەنی فەرمانی کرد خەڵاتێکیش بەو بدەن.

* ڕۆژێکیان حەجاج لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵەکانی ڕۆیشتە دەرەوە بۆ ڕاو، کاتێك خواردنیان ئامادە کرد بە هاوەڵەکانی وت: بزانن کێ لەو دەوروبەرەیە بانگی بکەن با بێت نان بخوات، ئەوانیش هەموو چواردەوری خۆیان گەڕان کەسیان نەدۆزیەوە تەنها پیاوێکی دەشتەکی نەبێت لەگەڵ خۆیان هێنایان.

حەجاج پێی وت: وەرە ئەی پیاوی دەشتەکی نان بخۆ.

دەشتەکیەکە وتی: یەکێکی لەتۆ بەڕێزتر بانگی کردوم وەڵامم داوەتەوە.

حەجاج وتی: کێیە؟

دەشتەکیەکە وتی: خوای باڵادەست بانگی کردم بۆ ئەوەی بەڕۆژو بم، بەڕۆژوم.

حەجاج وتی: ڕۆژو لەو ڕۆژە گەرمەدا؟

دەشتەکیەکە وتی: بۆ ڕۆژێکی زۆر گەرمتر لەمڕۆ بەڕۆژوم.

حەجاج وتی: ئەمڕۆ بیشکێنەو ڕۆژێکی تر بەڕۆژو بە.

دەشتەکیەکە وتی: ئایا کەفالەتی ئەوە دەکەیت کە زیندو دەبم تا بەیانی؟

حەجاج وتی: نا توانای ئەوەم نیە.

دەشتەکیەکە وتی: ئەی چۆن داوام وای لێ دەکەیت؟

حەجاج وتی: ئەوە خواردنێکی زۆر خۆشە.

دەشتەکیەکە وتی: بەخوا ئەوە چێشتلێنەرەکانت خۆشیان نەکردوە، بەڵکو تەندروستی باشت خۆشی کردووە.

حەجاج وتی: دوری خەنەوە لێم.

* دەگێڕنەوە کە پیاوێك بە عبداللە کوڕی عامڕی وت: داوایەکم لێت هەیە بۆم جێبەجێ دەکەیت؟
عبداللە وتی: بەڵێ، وە منیش داوایەکم لێت هەیە بۆم جێبەجێ دەکەیت؟
پیاوەکە وتی: بەڵێ.
عبداللە وتی: داواکەت بڵێ.
پیاوەکە وتی: دەمەوێت ئەو خانوەی کە هەتە پێشکەشی منی بکەیت.
عبداللە وتی: باشە.
پیاوەکە وتی: دەی تۆش داواکەت بڵێ.
عبداللە وتی: دەمەوێت واز لە داواکەت بێنیت.
پیاوەکە وتی: باشە ئەوە وازم هێنا.

* چەند کەسێك پیاوێکیان هێنایە لای قازی وتیان: دە هەزار درهەمی ئێمەی لایە ناماندەتەوە.
قازی وتی: چی دەڵێیت ئەی پیاو؟
پیاوەکە وتی: ئەوەی دەیڵێن ڕاستە بەڵام داوایان لێ دەکەم کە مۆڵەتم بدەن تا خانوەکەم و وشترو مەڕەکانم دەفرۆشم پاشان مافی خۆیان پێ دەدەم.
پیاوەکان وتیان: درۆ دەکات جەنابی قازی بەخوا هیچ شتێکی نیە تا بیفرۆشێت نە زۆر نە کەم.

پیاوەكە بە قازی وت: گوێت لێ بوو خۆیان شایەدییان دا كە هیچ شتێكم نیە ئەی چۆن داوام لێ دەكەن كە قەرزەكەیان بدەمەوە؟
هەموانی بێدەنگ كردو قازی فەرمانی كرد بەری بدەن.

* یەكێك بە پیاوێكی وت: ناوت چیە؟
وتی: دەریا.
وتی: ئەی كونیەكەت چیە؟
وتی: أبو الفیض (باوكی لافاو).
وتی: ئەی ناوی باوكت چیە؟
وتی: فورات.
پیاوەكە وتی: ئەوەی بیەوێت بێتە لات دەبێت بە بەلەم بێت.

* دەشتەكییەك هاتە لای سلێمانی كوڕی عبدالملك كە خەریكی خواردنی جۆرە شیرنەمەنیەك بوو، سلێمان وتی: فەرموو بخۆ ئەوەی ئەو جۆرە شیرنەمەنیە بخوات مێشكی زیاد دەكات.
پیاوەكە وتی: ئەگەر ئەوە ڕاست بوایە دەبوو سەری خەلیفە وەك سەری ئێستر بوایە.

* پیاوێكی هەژار ڕۆیشتە لای پیاوێكی دەوڵەمەندو پێی وت: من دراوسێتم براكەم مردووە یارمەتیم بدە بۆ ئەوەی كفنێكی بۆ بكرم.

دەوڵەمەندەکە وتی: بەخوا ئێستا هیچم لا نیە بەڵام دوای چەند ڕۆژێکی تر وەرەوە لە خزمەتدام.

پیاوەکە وتی: براکەم بخەمە ناو ئاو و خوێوە تا چەند ڕۆژێکی تر تۆ کفنی بۆ دەکڕیت؟

* دەشتەکیەك لای پیاوێك وەستا کە نانی دەخوارد، سەلامی لێ کردو ئەویش وەڵامی دایەوە پاشان لێی نزیك بوویەوە بۆ ئەوەی فەرموی بکات بەڵام پیاوەکە گوێی پێ نەدا، دەشتەکیەکە وتی: بەلای ماڵی ئێوەدا هاتم.

پیاوەکە وتی: ڕێگەکەت بەوێدا بووە.

دەشتەکیەکە وتی: خێزانەکەت دووگیان بوو.

پیاوەکە وتی: کە هاتیشم دووگیان بوو.

دەشتەکیەکە وتی: بەڵام منداڵی بوو.

پیاوەکە وتی: هەر دەبوو بیبێت.

دەشتەکیەکە وتی: دوو کوڕی بوو.

پیاوەکە وتی: دایکیشی وا بوو.

دەشتەکیەکە وتی: یەکێکیان مرد.

پیاوەکە وتی: دیارە دایکی توانای نەبووە شیر بدات بە هەردوکیان.

دەشتەکیەکە وتی: ئەوەی تریش مرد.

پیاوەکە وتی: نەیتوانیوە دوای براکەی بژیت.

دەشتەکیەکە وتی: دایکیشیان مرد.

پیاوەکە وتی: لە خەفەتی دوو کوڕەکەی مردووە.

دەشتەکیەکە وتی: خواردنەکەت چەند خۆشە.

پیاوەکە وتی: بۆیە بە تەنها دەیخۆم، بەخوا تامی ناکەیت.

* وەلیدی کوڕی یەزید ڕۆیشتە لای هیشامی کوڕی عبدالملك، هیشام وتی: ئەو مێزەرەت بە چەند کڕیوە؟

وەلید وتی: بە هەزار درهەم.

هیشام وتی: مێزەرێك بە هەزار درهەم.. زۆر زۆرە.

وەلید وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران ئەوەم بۆ بەڕێزترین ئەندامی لاشەم کڕیوە، تۆ کەنیزەکێکت بە دە هەزار درهەم کڕیوە بۆ سوکترین ئەندامی لاشەت.

* پیاوێکی یەهودی بە عەلی کوڕی ئەبو طالیبی وت (خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەرەکەتان نەناشت کە پشتیوانەکان وتیان: فەرمانڕەوایەك لە ئێمەو فەرمانڕەوایەك لە ئێوە.

عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ئێوە کاتێك خوا لە دەریاکە پەڕاندنیەوە پێیەکانتان وشك نەبوویەوە کە چاوتان بە خەڵکێك کەوت بە دەوری بتەکانیاندا دەخولانەوەو دەیانپەرستن وتتان: ئەی موسا خوایەکیش بۆ ئێمە ساز بکە وەکو ئەوانە چەند خوایەکیان هەیە.

* فەرمانڕەوایەك بە وەزیرەکەی وت: باشترین شتێك کە بەندە هەیبێت چییە؟

وەزیرەکە وتی: عەقڵێك پێی بژیت.

فەرمانڕەواکە وتی: ئەی ئەگەر نەی بوو.

وەزیرەکە وتی: ڕەوشتێك خۆی پێ بڕازێنێتەوە.

فەرمانڕەواکە وتی: ئەی ئەگەر نەی بوو.

وەزیرەکە وتی: سەروەت و سامانێك دایبپۆشێت.

فەرمانڕەواکە وتی: ئەی ئەگەر نەی بوو.

وەزیرەکە وتی: بروسکەیەك لە ئاسمانەوە بێت و بیسوتێنێت و لەکۆڵ خەڵکەکەو شارەکەی بکاتەوەو ئاسودەیان بکات.

* پیاوێك پرسیاری لە عومەری کوڕی قەیس کرد: ئەگەر یەکێك لە مزگەوت بەردێك یان شتێکی بچوکی بینی بە نێوچاوانیەوە یان لەناو گۆرەویەکانی یان لەناو جلەکانی چی لێ بکات؟

عومەر وتی: با فڕێی بدات.

پیاوەکە وتی: ئاخر دەڵێن زیکری خوا دەکات تا لە مزگەوت دەچێتە دەرەوە.

عومەر وتی: دەی مادام وایە با وازی لێ بێنێت تا قوڕگی دەدڕێت.

پیاوەکە وتی: بۆ قوڕگیشی هەیە؟

عومەر وتی: ئەی چۆن زیکر دەکات.

* پیاوێك پرسیاری لە عەباس کرد خوا لێی ڕازی بێت: تۆ گەورەتری یان پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم)؟
عەباس وەڵامی دایەوە: پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم) لە من گەورەترە بەڵام من پێش ئەو لە دایك بووم.

* بە دەشتەکیەکیان وت: دەزانیت بە جوانی نزا بکەیت؟
وتی: بەڵێ.
وتیان: دەی نزا بکە.
وتی: خوایە تۆ ئیسلامت بە ئێمە بەخشی بێ ئەوەی داوات لێ بکەین، لە بەهەشتیش بێبەشمان نەکەیت کە ئێمە داوات لێ دەکەین.

* نوسەرێکی گەنج ڕۆیشتە لای ئەلکسەندەر تۆماس ڕۆماننوسی بەناوبانگی فەرەنسی داوای لێ کرد بەیەکەوە یەکێك لە چیرۆکە مێژووییەکان بنوسن، دۆماس بە خۆبەگەورەزانین و گاڵتەوە پێی وت: چۆن کەرو ئەسپ بەیەکەوە دەتوانن عەرەبانەیەك ڕابکێشن؟
نوسەرە گەنجەکە وەڵامی دایەوە: ئەوە سوکایەتییە بەمنی دەکەیت، چۆن ڕێگە بەخۆت دەدەیت بە ئەسپ وەسفم بکەیت؟

* ئەنشتاین بەردەوام چاویلکەی بەکار دەهێنا ڕۆژێکیان ڕۆیشتە چێشتخانەیەك، کاتێك شاگردەکە لیستی خواردنەکانی بۆ هێنا بۆ ئەوەی بیخوێنێتەوەو ئەوەی حەزی لێیەتی داوای بکات ئەنشتاین بۆی دەرکەوت کە چاویلکەکەی بیر چووە بۆیە بانگی شاگردێکی کرد بۆ ئەوەی لیستەکەی بۆ بخوێنێتەوە.
شاگردەکە وتی: بەداخەوە بەڕێزم منیش وەك تۆ نەزان و نەخوێندەوارم.

* پیاوێك پرسیاری لە (ئەگاثا مێری کلاریسا) کە نوسەرێکی ئینگلیزیە کرد: بۆچی شوت بە پیاوێکی شوێنەوارناس کردووە؟
وتی: لەبەر ئەوەی تا بەتەمەنتر بم نرخم لای ئەو زیاتر دەبێت.

* بە ئیمام عەلی یان وت: چۆن خوا لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو هەموو خەڵکەدا دەکات، سەرەڕای زۆری ژمارەیان؟
وتی: هەروەك چۆن ڕزقیان دەدات سەرەڕای زۆری ژمارەیان.

* یەکێك پرسیاری لە عەلی کوڕی ئەبو طالیب کرد: دوری نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا چەندە؟
وتی: ئەندازەی یەك ڕۆژ ڕۆیشتنی خۆر.

* پیاوێك بە ئەبوبەکری وت: بەخوا جنێوێکی وات پێ دەدەم لەگەڵت بێتە گۆڕەکەتەوە.
ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە: بەخوا لەگەڵ تۆ دێت نەوەك لەگەڵ من.

* خەلیفە موعتەصیم سەردانی خاقانی کرد کاتێك نەخۆش کەوتبوو، خەلیفە ویستی لێهاتویی و زیرەکی فەتحی کوڕی تاقی بکاتەوە پێی وت: ئەی فەتح ماڵی من باشترە یان ماڵی باوکت؟
فەتح وەڵامی دایەوە: مادام پێشەوای باوەڕداران لە ماڵی باوکمە ئەوە ماڵی باوکم باشترە.
خەلیفە وتی: جوانترین وەڵام وەڵامی تۆیە ئەی فەتح.

* بە عبدالله کوڕی عەباسیان وت: عومەری کوڕی ڕەبیعە ئەو شەوە لە دایك بوو کە عومەری کوڕی خەتاب وەفاتی کرد، بە ناوی ئەوەوە ناونراوە.
وتی: واتا ئەو شەوە حەق بەرز کرایەوەو ستەم لە جێگەی دانرا.

* یەهودیەك کە جلەکانی شڕو پیس بوون بە مسوڵمانێکی وت کە جوانترین جلی لەبەردا بوو: ئایا پێغەمبەرتان نەیفەرمووە دونیا بەهەشتی کافرانەو زیندانی مسوڵمانانە؟
مسوڵمانەکە وتی: بەڵێ ڕاستە.

یەهودیەکە وتی: ئەی بۆ ئەوە حاڵی منەو ئەوەش حاڵی تۆیە، ژیانت زۆر لە هی من خۆشترە؟

مسوڵمانەکە وتی: ئەگەر ئەوە ببینیت کە خوا پەیمانی داوە پاداشتم پێی بکات وە ئەوەی بۆ تۆی ئامادە کردووە لە سزا ئەوکاتە بۆت دەردەکەوێت کە من لە زیندان دام و تۆش لە بەهەشتدای.

* پیاوێك بە یەکێکی وت: لەخەودا بینیم لەگەڵ دایکت جووت بووم، پیاوەکە تورە بوو چوون بە گژ یەکداو پاشان رۆیشتنە لای عەلی خوا لێی رازی بێت پیاوەکە وتی: دەبێت حەدی لێ دەربکرێت بە قامچی لێی بدرێت (هەروەك چۆن لە یەکێك دەدرێت کە زینای کردبێت).

عەلی خوای لێ رازی بێت وتی: لەبەرخۆر بیوەستێنەو سەد قامچی لە سێبەرەکەی بدە.

* سالمی کوڕی عبدالله جلێکی کۆن و شڕی لەبەر بوو هاتە لای سلێمانی کوڕی عبدالملك، سلێمان لای خۆی لەسەر جێگەکەی داینیشاند، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش لەوێ بوو پیاوێك کە جلێکی نوێ و جوانی لەبەر بوو وتی: ئەی عومەر خاڵت (سالمی کوڕی عبدالله) نەیدەتوانی جلێکی نوێ و جوان لەبەر بکات کاتێك دێتە لای پێشەوای باوەڕداران؟

عومەر وتی: نابینم کە جلەکانی پلەی ئەویان نزم کردبێتەوە وە ناشبینم ئەو جلانەی تۆش پلەی تۆیان بەرز کردبێتەوە بۆ ئاستی ئەو.

پیاوەکە تەریق بوویەوەو هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.

* هەندێك دیلیان هێنایە لای حەجاج، یەکێك لە دیلەکان وتی: ئەی فەرمانڕەوا من مافێکم بەسەرتەوە هەیە.
حەجاج وتی: مافت چییە بەسەر منەوە؟
دیلەکە وتی: ڕۆژێکیان (ابن الأشعث) جنێوی پێدای منیش وەڵامم دایەوەو لەسەرت بە دەنگ هاتم.
حەجاج وتی: شایەدت هەیە؟
دیلەکە وتی: بەڵێ ئەو پیاوەش لەوێ بوو، پیاوەکەش یەکێك بوو لە دیلەکان.
حەجاج وتی: ئەو قسەیەی دەیڵێت ڕاستە؟
پیاوەکە وتی: بەڵێ ڕاست دەکات من ئاگام لێ بوو.
حەجاج وتی: ئەی تۆ بۆ لەسەرم بەدەنگ نەهاتی و وەڵامت نەدایەوە؟
پیاوەکە وتی: لەبەرئەوەی من ڕقم لێتە.
حەجاج فەرمانی کرد هەردووکیان ئازاد بکرێن یەکەمیان لەبەرئەوەی مافی بەسەرەوە هەبوو کە لەسەری بە دەنگ هاتبوو، دووەمیشیان لەبەر ڕاسگۆیی و نەترسانەکەی کە وتی ڕقم لێتە.

* کاتێك ئیسماعیل کوڕی حەمماد کوڕی ئەبو حەنیفە ڕۆیشتە بەصرە وتی: حەز دەکەم ئەو کەسە تەمێ بکەم کە پێچەوانەی ئەبو حەنیفە بکات.

یەکێك وتی: ئایا ئەبو حەنیفە ئەو کەسانەی تەمێ دەکرد کە پێچەوانەی ئەویان دەکرد؟

ئیسماعیل وتی: نەخێر.

پیاوەکە وتی: دەی کەواتە یەکەمجار خۆت تەمێ بکە لەبەرئەوەی پێچەوانەی ئەوت کرد.

* پیاوێك زەیتونی دەفرۆشت، ئافرەتێك هاتە لای بۆ ئەوەی بە قەرز لێی بکڕێت.

پیاوەکە وتی: لێی بخۆ بزانە تامی چۆنە.

ئافرەتەکە وتی: من بەڕۆژوم لەقەرزی ڕەمەزانی ساڵی پار.

پیاوەکە وتی: کەواتە بە قەرز ناتدەمێ..یەك ساڵە قەرزی خوات دواخستووە داواش لە من دەکەیت بەقەرز پێت بدەم، کەی قەرزەکەی من دەدەیتەوە.

* کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب عەمری کوڕی عاصی کرد بە والی میسڕ پرسیاری لێ کرد:

ئەگەر دزێکت هاتە لا چی لێدەکەیت؟

وتی: دەستی دەبڕم.
عومەر وتی: بەڵام ئەگەر برسیەك هاتە لای من ئەوا من دەستی تۆ دەبڕم.

* مێشولەیەك لە خەلیفەی عەباسی (ئەبو جەعفەری مەنصور ) نیشت ئەویش دەری کرد، دیسان گەڕایەوە ئەویش دەری کردەوە دیسان گەڕایەوە هەتا بێزاری کرد، (جەعفەری کوڕی محمدی کوڕی علی) هاتە ژورەوە، مەنصور پێی وت: ئەی باوکی عبدالله بۆچی خوای (عزوجل) مێشولەی دروست کردووە؟
وتی: بۆ ئەوەی ستەم کارانی پێ زەلیل بکات.

* پیاوێك دەگێڕێتەوە دەڵێت: شەوێکیان لە گوند چوومە دەرەوە بۆ هەندێك کارم بینیم ئافرەتێکی نابینا گۆزەیەکی لەسەرشان هەڵگرتبوو چرایەکیشی بە دەستەوە گرتبوو دەڕۆیشت هەتا گەیشتە سەر ڕوبارەکە، منیش بە سەرسوڕمانەوە چاودێریم دەکرد، گۆزەکەی لە ڕووبارەکە پڕ کردو بە ڕێگەکەدا گەڕایەوە بۆ گوندەکە.
پێم وت: باشە تۆ نابینایت و ڕۆژو شەو لای تۆ وەك یەکە بۆچی ئەم چرایەت هەڵگرتووە؟
وتی: بۆ ئەوە هەڵمگرتووە نەوەك دڵ کوێرێکی وەك تۆ لە تاریکیدا خۆم پێدادات و گۆزەکەم بشکێنێت.

* ڕۆژێکیان باوکێك کوڕەکەی نارد بۆ ئەوەی سەرێکی برژاوی بۆ بکرێت، کوڕەکە سەرەکەی کڕی و لە ڕێگا دانیشت چاوەکانی و گوێیەکانی و زمانی و مێشکەکەی خواردو ئەوەی مایەوە بۆ باوکی بردەوە.

کاتێك باوکی سەیری سەرەکەی کرد وتی: ئەوە چییە؟

وتی: ئەو سەرەیە کە داوات کردبوو.

باوکەکە وتی: ئەی کوا چاوەکانی؟

کوڕەکە وتی: کوێر بووە.

باوکەکە وتی: ئەی کوا گوێیەکانی؟

کوڕەکە وتی: کەڕ بووە.

باوکەکە وتی: ئەی کوا زمانەکەی؟

کوڕەکە وتی: لاڵ بووە!

باوکەکە وتی: ئەی کوا مێشکەکەی؟

کوڕەکە وتی: بێ مێشك بووە!

باوکەکە وتی: هەستە بیبەوەو دانەیەکی تر بێنە.

کوڕەکە وتی: خاوەنەکەی بەم عەیبانە پێی فرۆشتووم تازە لێم وەرناگرێتەوە.

* لەگەڵ خێزانەکەی دانیشتبوو خورمایان دەخوارد.

خێزانەکەی وتی: دەبینم دەنکەکان لە دەمت ناهێنیتە دەرەوە دەیانخۆیت یان چی؟

وتی: بەڵێ دەنکەکانیش دەخۆم لەبەرئەوەی فرۆشیارەکە کاتێك خورماکەی بۆ کێشام بە دەنکەکانەوە کێشای وە کاتێك پارەکەم دایە پارەی خورماو دەنکەکانیشم دایە، شتێك پارەم پێ دابێت چۆن فڕێی دەدەم.

* پرسیار کرا لە ابن تیمیە: کامەیان سودی زیاترە بۆ مرۆڤ (سبحان الله) یان (استغفرالله) ؟
ابن تیمیە وەڵامی دایەوە: ئەگەر جل وبەرگ پاك بێت ئەوا بخورو بۆنی گوڵ باشترە بۆی.
وە ئەگەر جل و بەرگ پیس بوو سابون و ئاوی گەرم باشترە بۆی.
(سبحان الله) بخوری پاکانە و (استغفرالله) سابوونی تاوانباران و سەرپێچیکارانە.

* عیمڕانی کوڕی حیطان خێزانێکی جوانی هەبوو، بۆ خۆشی کورت و ناشیرین بوو.. ڕۆژێکیان خێزانەکەی وتی: پێم وایە من و تۆ دەچین بۆ بەهەشت.
عیمڕان وتی: چۆن؟
خێزانەکەی وتی: لەبەرئەوەی تۆ یەکێکی وەك منت پێدراوە تۆش سوپاسگوزاری، منیش توشی یەکێکی وەك تۆ بووم و ئارام گرم، کەسی سوپاسگوزارو ئارامگریش لە بەهەشتن.

* ڕۆژێك لە ڕۆژان پیاوێکی دەوڵەمەند سەبەتەیەکی پڕ لە خۆراکی خراپی دا بە پیاوێکی هەژار.
پیاوە هەژارەکە پێکەنی و سەبەتەکەی لەگەڵ خۆی بردو کۆشکەکەی جێهێشت.
دوای ئەوەی هەژارەکە سەبەتەکەی بەتاڵ کردو جوان پاکی کردەوە ئینجا پڕی کرد لە گوڵی جوان و گەڕایەوە بۆ کۆشکەکەو دای بە پیاوە دەوڵەمەندەکە.
پیاوە دەوڵەمەندەکە سەرسام بوو وتی: من سەبەتەیەکی پڕ لە خۆراکی خراپ و تێکچوم دا بە تۆ بۆچی تۆ پڕ لە گوڵ بۆم دەگێڕیتەوە؟
هەژارەکە وەڵامی دایەوە: هەموو مرۆڤێك ئەوە دەبەخشێت کە لە دڵی دایە.

* دوو کەس بوو بە مشتومڕیان و چوونە لای قازی یەکێکیان وتی: ئەو پیاوە کۆڵێکی قورسی هەڵگرتبوو، کەوتە سەر زەوی و داوای لە من کرد یارمەتی بدەم، منیش وتم: چیم دەدەیتێ ئەگەر یارمەتیت بدەم، وتی هیچ منیش ڕازی بووم و کۆڵەکەم هەڵگرت.
ئێستاش دەمەوێ هیچەکەم بداتێ.
قازی وتی: سکاڵاکەت تەواوە کوڕم، نزیك بەرەوە لێم و ئەو کتێبە بەرز بکەرەوە. کاتێك بەرزی کردەوە پێی وت: چیت دۆزیەوە لە ژێری؟

پیاوەکە وتی: هیچ.

قازی وتی: دەی هەڵی گرە بۆ خۆت و برۆ.

* پیاوێك هەندیك ئاسنی لای بازرگانێك جێهێشتبوو، کاتێك گەڕایەوە لای بازرگانەکەو داوای ئاسنەکەی کردەوە بازرگانەکە پێی وت: ئاسنەکە مشك خواردویەتی.

پیاوەکە وای نیشان دا کە باوەڕی کردووە، دوای چەند ڕۆژێك پیاوەکە کوڕی بازرگانەکەی بینی یەکسەر ڕفاندی و لای خۆی شاردیەوە، بازرگانەکە دەستی کرد بە گەڕان بە دوای کوڕەکەیدا کاتێك پیاوەکەی بینی پرسیاری لێکرد کە کوڕەکەی نەبینیوە، پیاوەکە وەڵامی دایەوە: گوێم لە جریوە جریوێك بوو کاتێك سەیرم کرد بینیم چۆلەکەکان منداڵێکیان هەڵگرتووە!

بازرگانەکە وتی: جا چۆن چۆلەکە دەتوانن منداڵێك هەڵبگرن؟

پیاوەکە وەڵامی دایەوە: ئەو شارەی کە مشك تێیدا ئاسن دەخوات چۆلەکەشی تێدا کە منداڵ هەڵبگرن.

بازرگانەکە پێکەنی و ئاسنەکەی گەڕاندەوە بۆ پیاوەکە.

* ڕۆژێکیان دەعبول مەنجەڵێکی گەورەی لە ماڵی دراوسێکەی هێناو خواردنی تێدا ئامادە کرد، کاتێك مەنجەڵەکەی گەڕاندەوە بۆ خاوەنەکەی مەنجەڵێکی بچوکی خستە ناو مەنجەڵەکە.

دراوسێکەی پرسیاری کرد: ئەو مەنجەڵە بچوکە چیە؟
وتی: ئەوە مەنجەڵەکەتان زاوەو ئەو مەنجەڵە بچوکەی بووە هی خۆتانە.
دوای چەند ڕۆژێك دەعبول مەنجەڵە گەورەکەی لە دراوسێکەی وەرگرتەوە بەڵام ئەم جارە بۆی نەگەڕاندنەوە.
کاتێك دراوسێکەی هات داوای مەنجەڵەکەی کردەوە دەعبول وتی: مەنجەڵەکەتان مردووە!
دراوسێکەی سەری سوڕماو وتی: چۆن مەنجەڵ دەمرێت؟
وەڵامی دایەوە: چۆن باوەڕت کرد کە مەنجەڵەکەتان زا بەڵام باوەڕ ناکەیت کە مەنجەڵەکەتان مردووە؟!

* سوڵتان عبدالعزیز هاتە میسر، لەگەڵ خدێوی ئیسماعیل سەردانی زانکۆی ئەزهەریان کرد.
خدێوی بینی کە شێخی ئەزهەر گرنگیان پێ نادات، پاڵکەوتووەو قاچی ڕاکێشاوە.
خدێوی داوای لە پیاوێکی کرد کیسەیەك پارە ببات بۆ شێخ، دەیویست بۆ لای خۆی ڕایبکێشێت و بارودۆخیشی بزانێت.
کاتێك پیاوەکە هاتە لای شێخ بۆ ئەوەی کیسە پارەکەی پێ بدات دەستی کێشایەوەو پێی وت: بەو کەسە بڵێ کە تۆی ناردووە: ئەوەی قاچی ڕابکێشێت دەستی ڕاناکێشێت.

* جوحا لە نهۆمی سەرەوەیماڵەکەی بوو، کەسێك لە دەرگای ماڵەکەی دا، لە پەنجەرەکەوە سەری دەرهێنا بینی پیاوێکە.

پێی وت: فەرموو چیت دەوێت؟

پیاوەکە وتی: وەرە خوارەوە با قسەت لەگەڵدا بکەم.

جوحا هاتە خوارەوەو وتی: فەرموو.

پیاوەکە وتی: من کەسێکی هەژارم دەمەوێت یارمەتیم بدەی.

جوحا لێی توورە بوو بەڵام تورەییەکەی شاردەوەو وتی: دوام کەوە، جوحا چووە سەرەوەو پیاوەکەش دوای کەوتبوو کاتێك گەیشتنە نهۆمی سەرەوە ئاوڕێکی دایەوەو بە کابرای وت: خوا بتداتێ.

پیاوەکە وتی: ئەی باشە بۆ لە خوارەوە ئەوەت پێت نەوتم؟

جوحا وتی: ئەی باشە تۆ بۆچی منت هێنایە خوارەوەو قسەکەت پێ نەوتم کاتێك من لەسەرەوە بووم.

* قوتابیەك تاقیکردنەوەی هەبوو لە یەکێك لەو مادانەی کە تایبەت بوو بە جیهانی باڵندەکان.

کاتێك ڕۆژی تاقیکردنەوەکە نزیك بوویەوە قوتابیەکە دەستی کرد بە پێداچونەوەی مادەکەو هەوڵێکی زۆری دا ویستی نمرەی تەواوی لێ بێنێت، ئەوەندە متمانەی بە خۆی هەبوو کە هەر پرسیارێك بێتەوە بە ئاسانی وەڵامی دەداتەوەو سەرکەوتوو دەبێت لە تاقیکردنەوەکە.

کاتێك قوتابیەکە پرسیاری تاقیکردنەوەکەی وەرگرت توشی شۆك بوو، بینی مامۆستاکە تەنها یەك پرسیاری هێناوەتەوە ئەویش وێنەی قاچی چەند باڵندەیەك بوو کە داوای دەکرد لە ڕێگەی وێنەی قاچەکانیانەوە ناوی باڵندەکان بنوسێت.

قوتابیەکە وەڵامەکەی نەدەزانی بۆیە بە تورەیی یەوە هەستاو وەرەقەی دایە مامۆستاکەو وتی: بێ ماناترین پرسیارێك تا ئێستا بینیبێتم ئەو پرسیارانەیە..ئینجا ویستی بڕواتە دەرەوە.

کاتێك مامۆستاکە وەرەقەکەی لە قوتابیەکە وەرگرت سەیری کرد ناوەکەی نەنوسیوە.

مامۆستاکە وتی: ناوت چی یە؟ بۆ ناوەکەت نەنوسیوە؟

قوتابیەکە ئاماژەی بە قاچەکانی کردو وتی: سەیری قاچەکانم بکەو لە ڕێگەی قاچەکانمەوە ناوەکەم بزانە!

* ڕۆژێکیان بەندەیەك ئاوی بەدەستی ئیمام جەعفەری صادق دا دەکرد، هەندێك ئاو بەرجلەکانی کەوت ئەویش بە تورەیی یەوە سەیرێکی بەندەکەی کرد.

بەندەکە وتی: ﴿ والكاظمين الغيظ﴾ واتە: وە ئەوانەی ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوە.

وتی: ئەوە ڕقم خواردەوە.

بەندەکە وتی: ﴿ والعافين عن الناس ﴾ واتە: وە لە خەڵکی دەبورن لێیان خۆش دەبن.

وتی: ئەوە لێت خۆش بووم

بەندەکە وتی: ﴿ والله يحب المحسنين﴾ آل العمران: ١٣٤.

واتە: خواش چاکەکارانی خۆش دەوێت.

ئیمام جەعفەر وتی: ئەوە تۆ ئازادیت لەڕێی خوا وە هەزار دیناریش لە ماڵی من بۆ تۆ.

* مەسیحیەك پێشوازی لە پیاوێکی مسوڵمان کرد لە ماڵەکەی خۆی.

مەسیحیەکە ترێی بۆ پیاوە مسوڵمانەکە هێنا و ئەویش خواردی.

پاشان شەڕاب (مەی) بۆ هێنا مسوڵمانەکە وتی: حەرامە نایخۆمەوە.

مەسیحیەکە وتی: سەرم سوڕماوە لە ئێوەی مسوڵمان ئەوە حەڵاڵ دەکەن و ئەوە حەرام دەکەن هەرچەندە ئەو شەڕابەش لەو ترێیە دروست کراوە.

مسوڵمانەکە وتی: ئایا خێزانت هەیە؟

مەسیحیەکە وتی: بەڵێ.

مسوڵمانەکە وتی: بیهێنە ئێرە.... ئەویش هێنای.

پاشان پێی وت: ئایا کچت هەیە؟

مەسیحیەکە وتی: بەڵێ.

مسوڵمانەکە وتی: بیهێنە ئێرە.... ئەویش هێنای.

مسوڵمانەکە وتی: ئایا نابینیت کە خوا ئەمەی (ژنەکە) بۆ تۆ حەڵاڵ کردوەو ئەمەی (کچەکە) بۆتۆ حەرام کردووە لەگەڵ ئەوەی کە ئەوە لە ئەوەیە.

* لویسی چواردەیەم پاشای فەرەنسا بەوە بەناوبانگ بوو کە زۆر گرنگی بە ئەدەب و نوسەرو شاعیران دەدا، بوالۆی شاعیر کەسێکی زۆر نزیك بو لە پاشا، رۆژێکیان پاشا بە بیریدا هات کە هۆنراوەیەك بنوسێت و بۆ بوالۆی شاعیری بخوێنێتەوە بۆ ئەوەی رای خۆی لەسەر بڵێت، کاتێك هۆنراوەکەی بۆ خوێندەوە بوالۆ وتی: ئەی پاشا تۆ خۆریت هەر کارێکت بوێت دەتوانیت بیکەیت ئەستەم لە قاموسی تۆدا نییە بۆ نمونە ویستت هۆنراوەیەکی خراپ بنوسیت زۆر سەرکەوتو بوویت.

* جارێکیان دەسەڵاتدارێکی فەرەنسا بەلای کێڵگەیەکدا رۆیشت کە هەندێك جوتیار کاریان تێدا دەکرد، سەیرێکی کردن و بە گاڵتەوە پێی وتن: دەی ئێوە ئێستا بیچێنن ئێمەش بەیانی دەیخۆین.
جوتیارێك وەڵامی دایەوە: بەڵام ئێمە جۆ دەچێنین..( ئاشکرایە کە جۆ خۆراکی کەرەکانە).

* دەڵێن بەرنادشۆ کەسێکی زۆر ناشیرین بوو، جارێکیان ئافرەتێکی سەماکار کە زۆر جوان بوو پێی وت: ئەی بەرنادشۆ خەڵك وا دادەنێن کە

تۆ زیرەکترین کەس بیت وە من جوانترین کەسم ئەگەر من و تۆ هاوسەرگیریمان بکردایە ئەوا منداڵەکانمان زیرەکترین و جوانترین منداڵ دەبوون.

بەرنادشۆ وتی: ئاخر دەترسم منداڵەکان شێوەیان لە باوکیان چوبایەو عەقڵیشیان لە دایکیان چوبایە ئەو کاتە شتەکە پێچەوانە دەبوویەوە.

* جارێکیان نوسەری فەڕەنسی بولّ بورجیە سوکایەتی بە ئەمریکیەکان کرد بە وتەکەی کە وتی: کەسی ئەمریکی تۆزێك کاتی هەبێت بەدوای ڕەگ و ڕیشەو ڕەچەڵەکی خۆی و باب و باپیرانیدا دەگەڕێت.

کاتێك نوسەری ئەمریکی مارك توین ئەوەی خوێندەوە وەڵامی دایەوەو وتی: ئەوە ڕاستە بەڵام کەسی فەڕەنسی هەموو کاتێکی لەوەدا بەسەر دەبات بزانێت کێ باوکیەتی.

* لە ئاهەنگێکدا پیاوێك داوای لە ئافرەتێکی جوان کرد سەمای لەگەڵدا بکات بەڵام ئافرەتەکە ڕەتی کردەوەو وتی ناتوانم.

پیاوەکە وتی: بۆچی؟

ئافرەتەکە وتی: من تەنها لەگەڵ پیاوێکدا سەما دەکەم کە داهاتووی هەبێت.. پاشان پرسیاری لێ کرد ئەی تۆ بۆچی لەنێوان هەموو ئافەتەکاندا منت هەڵبژارد؟

پیاوەکە وتی: لەبەرئەوەی من حەز دەکەم لەگەڵ ئافرەتێکدا سەما بکەم کە ڕابردووی هەبێت.

* پیاوێك هاتە لای حەجاجی کوڕی یوسف و هۆنراوەیەکی خوێندەوەو وتی:

أبا هشام ببابك          قد شم ريح كبابك .

حەجاج وتی: وەی لە حاڵت بۆچی (أبا هشام)ت بە مەنصوبی خوێندەوە؟
پیاوەکە وتی: کونیەی خۆمە حەزم لێ بێت مەرفوعی دەکەم حەزم لێ بێت مەنصوبی دەکەم.

* پیاوێك بە لای کۆمەڵێکدا ڕۆیشت سەلامی لێ کردن و پاشان پرسیاری لە یەکێکیان کرد: ناوت چییە؟

وتی: غليظ (واتە: ڕەق، توندو تیژ).

بە دووەمیانی وت: ئەی تۆ ناوت چییە؟

وتی: خشن (واتە: زبر).

بە سێیەمیانی وت: ئەی تۆ ناوت چییە؟

وتی: وعر (واتە: سەخت).

بە چوارەمیانی وت: ئەی تۆ ناوت چییە؟

وتی: شدّاد (واتە: زۆردار، توندوتیژ ).

بە پێنجەمیانی وت: ئەی تۆ ناوت چییە؟

وتی: لاطم (واتە: زلە لێدەر).

بە شەشەمیانی وت: ئەی تۆ ناوت چییە؟

وتی: ظالم (واتە: ستەمکار).

پیاوەکە وتی: ئەی مالك لە کوێیە؟

وتیان: مالك کێیە؟

وتی: چۆن نایناسن بۆ ئێوە پاسەوانانی دۆزەخ نین؟

* ڕۆژێکیان گەنجێك کە بەناوبانگ بوو بەوەی ڕەوشتی خراپە گوستیلەیەکی زێڕی لە پەنجە کردبو خۆی پێ هەڵدەکێشاو بە پیاوێکی وت: ئەم گوستیلەیەت پێ چۆنە زۆر جوان نییە؟
پیاوەکە وتی: با وەك ئەوە وایە گوێدرێژێك زینی زێڕی لەسەر بێت.

* فەیلەسوفێکی ئافرەتی بەتەمەن سەیری پیاوێکی کرد کە خەریك بوو ماڵەکەی دەڕازاندەوەو بەنیازی ژن مارەکردن بوو، لەسەر دەرگای ماڵەکەی نوسی بووی هیچ شتێك لە شەڕ نابێت لەم دەرگایە بێتە ژورەوە.
فەیلەسوفەکە وتی: ئەی خێزانەکەت لە کوێوە دەچێتە ژورەوە.

* بە شاعیرێکیان وت: تۆ قسەی نادروست لە شعرەکانتدا دەڵێیت.
شاعیرەکە وتی: ئەوەی لە شاعیر داوا دەکرێت قسەی خۆش و جوانە، ڕاستگۆیی داوا لە پێغەمبەران دەکرێت.

* پیاوێکی گەمژە گازێکی لە ( ذوجانس ) گرت، قوتابیەکانی دوای پیاوەکە کەوتن بۆ ئەوەی تۆڵەی لێ بکەنەوە کاتێک گەڕانەوە پێی وتن: ئەوە بۆچی دوای کەوتن؟

وتیان: بۆ ئەوەی تۆڵەی تۆی لێ بکەینەوە.

وتی: باشە ئێوە ئەگەر ئێسترێك جووتەیەکی لێدان ئێوەش لێی دەدەنەوە؟

وتیان: نەخێر.

وتی: ئەی ئەگەر سەگێگ گازی لێ گرتن ئێوەش گازی لێ دەگرنەوە؟

وتیان: نەخێر.

وتی: دەی ئەو پیاوەش ڕەوشتی ئاژەڵانی گرتووەو خۆی بە ئەوان چواندووەو وەك ئەوان وایە کەواتە پێویست ناکات وەڵامی بدەنەوە.

* بە ذوجانسیان وت: فڵان کەس دەوڵەمەندە.

وتی: ئەوە نازانم تا نەزانم بیروبۆچونی چۆنە بەرامبەر بە ماڵ و سامان.

* یەکێك پیاوێکی بانگ کرد بۆ نانی ئێوارە، کاتێك خواردنیان هێنا بینی خواردنێکی خۆش نییەو بە دڵی نەبوو بۆیە پێی وت: تۆ بانگت نەکردووم بۆ نانی ئێوارە بەڵکو نانی ئێوارەت لێ قەدەغە کردم.

* بە ذوجانسیان وت: کەی واز لە مەدح و ستایشی یاروس دەهێنیت؟

وتی: هەرکاتێك یاروس وازی لە چاکەکانی خۆی هێنا.

* فەرمانڕەوایەك بەلای منداڵێکدا ڕۆیشت و پرسیاری لێ کرد: ئایا خوێندەواریت هەیە؟

منداڵەکە وتی: بەڵێ.

فەرمانڕەواکە وتی: دەی شتێکم بۆ بخوێنە.

ئەویش تۆزێك قورئانی بۆ خوێند.

فەرمانڕەواکە وتی: ئافەرین، ها ئەم دینارە بگرە بۆ خۆت.

منداڵەکە وتی: نامەوێت گەورەم.

فەرمانڕەواکە وتی: بۆچی؟

منداڵەکە وتی: دەترسم دایکم بیبینێت و لێم بدات.

فەرمانڕەواکە وتی: پێی بڵێ فەرمانڕەوا پێی دام.

منداڵەکە وتی: باوەڕ ناکات گەورەم.

فەرمانڕەواکە وتی: بۆچی؟

منداڵەکە وتی: لەبەرئەوەی وادەزانێت فەرمانڕەوا هەرگیز دینارێك بەتەنها نابەخشێت.

* دەڵێن ڕۆژێکیان ئەبونەواس لە بازاڕدا شەڕابی دەخواردەوە لەو کاتەدا خەلیفە بە بازاڕدا تێدەپەڕی و لە دوورەوە چاوی بە ئەبونەواس کەوت کە

خەریکی خواردنەوەیە، خەلیفە داوای کرد کە بیبینێت، ئەبو نەواس هاتە لای خەلیفەو شوشە شەڕابەکەی لە پشت خۆی شاردبوویەوە خەلیفە وتی: ئەو دەستەی پشتەوەتم نیشان بدە بزانم چی تێدایە، ئەبونەواس شەڕابەکەی خستە دەستەکەی ترو دەستی نیشانی خەلیفەدا، خەلیفە وتی: دەستەکەت ترم نیشان بدە، ئەبو نەواس شەڕابەکەی خستەوە دەستەکەی ترو ئەو دەستەشی نیشاندا، خەلیفە توڕە بوو وتی: هەردوو دەستەکانتم نیشان بدە، ئەبونەواس هەردووك دەستەکانی نیشان دا، خەلیفە وتی: ئەوە چیە لە دەستت دایە؟

ئەبونەواس وتی: شیرە.

خەلیفە وتی: ئەی بۆ ڕەنگی سورە؟

ئەبونەواس وتی: گەورەم بەخوا شەرمی لە تۆ کرد بۆیە ڕەنگی سور بوو.

* ڕۆژێکیان دوو پیاو لە بازاڕ شەڕیان بوو یەکێکیان بە دەنگێکی بەرز هاواری دەکردو هەڕەشەی دەکرد، یەکێك وتی: پێدەچێت ئەو پیاوە زۆر ئازا بێت.

یەکێك وەڵامی دایەوەو وتی: مەرج نییە نابینیت شێر بێدەنگە لەگەڵ ئەوەشدا ئازایەو خەڵك لێی دەترسێت و لێی ڕادەکات بەڵام سەگ لەگەڵ ئەوەی بەردەوام دەوەڕێت خەڵك بەردی تێ دەگرێت.

* رۆژێكیان سوفیانی كوڕی عویه‌ینه‌ گریا، ئه‌بو موحه‌مه‌د (یحیی بن أكثم) وتی: بۆچی ده‌گریت؟

سوفیان وتی: ئه‌وه‌ی من ده‌گریێنێت ئه‌وه‌یه‌ كه‌ له‌دوای دانیشتن له‌ مه‌جلیسی هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) توشی دانیشتن له‌ مه‌جلیسی ئێوه‌ بووم.

یه‌حیا وتی: كه‌واته‌ كاره‌ساتی هاوه‌ڵان به‌ دانیشتن له‌گه‌ڵ تۆ دوای دانیشتن له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) زۆر گه‌وره‌تر بووه‌.

* رۆژێكیان ته‌یمورله‌نگ پرسیاری له‌ جوحا كرد هه‌تا كه‌ی خه‌ڵك له‌ دایك ده‌بێت و ده‌مرێت؟

جوحا وتی: هه‌تا به‌هه‌شت و دۆزه‌خ پڕ ده‌بن.

* یه‌كێك له‌ دراوسێكانی هاته‌ لای جوحاو پێی وت: كچه‌كه‌م تۆزێك شێتۆكه‌یه‌و به‌رده‌وام خۆی ده‌ڕازێنێته‌وه‌و ده‌چێته‌ ده‌ره‌وه‌ هاتووم بۆ ئه‌وه‌ی شتێكی به‌سه‌ردا بخوێنی.

جوحا وتی: خوێندنی پیاوێكی پیری وه‌ك من سودی پێ ناگه‌یه‌نێت به‌ڵكو برۆ به‌دوای گه‌نجێكدا بگه‌ڕێ بۆ ئه‌وه‌ی ببێته‌ هاوسه‌ری.

* به‌ جوحایان وت: بۆچی كاتێك یه‌كێك داوای شتێكت لێ ده‌كات تا رۆژی دواتر پێی ناده‌یت؟

وتی: بۆ ئەوەی قەدری شتەکە بزانێت.

* زانایەك بە شارەکاندا دەگەڕا بەدوای کەسانی زانا بۆ ئەوەی گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات و زاڵ بێت بەسەریاندا هەتا گەیشتە شارەکەی جوحا پرسیاری لە خەڵکەکە کرد: ئایا هیچ زانایەك لەو شارەدا هەیە؟
وتیان بەڵێ، بۆیان بانگی جوحا کردو بە سواری کەرەکەی هات.
زاناکە پرسیاری لێ کرد: ناوەڕاستی زەوی کوێیە؟
جوحا وتی: ئەو شوێنەیە کە من ئێستا لێی وەستاوم، ئەگەر باوەڕیشم پێ ناکەیت دەتوانیت زەوی بپێویت.
زاناکە دۆش داماو پاشان وتی: ئەی ئەستێرەکان ژمارەیان چەندە؟
جوحا وتی: ژمارەیان بەقەد ژمارەی مووەکانی کەرەکەی منە ئەگەر باوەڕیش ناکەیت دەتوانیت ئەستێرەکان بژمێریت پاشان مووەکانی کەرەکەشم بژمێریت.
زاناکە پرسیاری کرد: ژمارەی مووەکانی ڕیشم چەندە؟
جوحا وتی: بەقەد ژمارەی مووەکانی کلکی کەرەکەمن، ئەگەر باوەڕیش ناکەیت دەتوانیت هەر موێك لە ڕیشی خۆت دەربکێشیت و پاشان مووێك لە کلکی کەرەکە دەربکێشیت هەتا هەردووکیان تەواو دەبن پاشان بیانژمێریت.
زاناکە سەرسام بوو بە وەڵامەکانی جوحاو بە پەشیمانیەوە گەڕایەوە.

* ڕۆژێك بە پەهلولیان وت: شێتەکانی شارمان بۆ بژمێرە.
پەهلول وتی: چۆن ئەو هەموو شێتە دەژمێردرێن، بەڵام ئەگەر دەتانەوێت عاقڵەکانتان بۆ دەژمێرم.

* ڕۆژێکیان گەنجێك لای شەعبی باسی شتێکی دەکرد، شەعبی وتی: ئێمە تا ئێستا شتی وامان نەبیستووە.
گەنجەکە وتی: بۆ تۆ هەموو شتێکت بیستووە؟
وتی: نەخێر.
گەنجەکە وتی: ئەی نیوەیت بیستووە؟
وتی: نەخێر.
گەنجەکە وتی: دەی ئەوە بەشێکە لەو شتەی کە نەتبیستووە.

* ژنێك بە پیاوەکەی وت: شەرم ناکەیت داوێن پیسی دەکەیت لەکاتێکدا ژنێکی حەڵاڵ و جوان و باشت هەیە.
پیاوەکە وتی: حەڵاڵ ڕاستە بەڵام جوان و باش نا.

* پرسیاریان لە ئەبو حارث کرد: ئەگەر پیاوی تەمەن هەشتا ساڵ ژن بهێنێت منداڵی دەبێت؟
وتی: بەڵێ، ئەگەر گەنجێکی تەمەن بیست ساڵی دراوسێیان بێت.

* پیاوێك منداڵێکی لەگەڵ بوو کە لە خۆی نەدەچوو پێیان وت: ئەوە بۆ منداڵەکەت هیچ لەخۆت ناچێت؟

وتی: دراوسێکان بزانن.

* مەنصوری عەباسی بۆ ئەبو عەبدوڵڵای نوسی: بۆ لێمان ناترسیت هەروەك چۆن خەڵك لێمان دەترسێت؟

ئەبو عەبدوڵڵا وەڵامی دایەوە: لە دونیادا هیچ شتێکمان نییە کە بەهۆی تۆوە لێی بترسین وە لە دواڕۆژیشدا هیچت نیە کە دوات لێ بکەین، وە لە نازونیعمەتدا نیت کە پیرۆزبایت لێ بکەین وە نە لە بەڵاو ناخۆشیش دایت سەرەخۆشیت لێ بکەین.

مەنصور وتی: ئەی ئەبو عەبدوڵڵا هاوڕێیەتیمان بکە بۆ ئەوەی ئامۆژگاریمان بکەیت.

ئەبو عەبدوڵڵا وەڵامی دایەوە: ئەوەی دونیای بوێت ئامۆژگاریت ناکات وە ئەوەی دواڕۆژیشی بوێت هاوڕێیەتیت ناکات.

* موعاویە ڕاوێژی بە ئەحنەفی کوڕی قەیس کرد دەربارەی کردنە خەلیفەی یەزید، ئەحنەف بێدەنگ بوو هیچ قسەیەکی نەکرد دەربارەی ئەوەی پرسیاری لێ کرا بوو، موعاویە پێی وت: چییە ئەحنەف بۆ بێدەنگیت ڕای خۆت بڵێ.

ئەحنەف وتی: بەخوا ئەی پێشەوای باوەڕداران ئەگەر ڕاستیەکەی بڵێین تووڕە دەبیت وە ئەگەر درۆش بکەین ئەوا خوا لەخۆمان تووڕە دەکەین، تووڕە بوونی پێشەوای باوەڕداران سوکترە لامان لە تووڕە بوونی خوا.

* پیاوێك ڕۆیشتە لای ئییاس کوڕی موعاویە قازی بەصرەو پرسیاری لێ کرد: ئایا ئەگەر خورما بخۆم هیچ کێشەیەکی تێدایە.

وتی: نەخێر.

پیاوەکە وتی:ئەی ئەگەر ئاوم بەسەردا خواردەوە؟

وتی: ئاساییە، دروستە.

پیاوەکە وتی: ئەی کەواتە بۆچی شەڕاب حەرام دەکەم لە کاتێکدا لەوەیە کە باسم کرد.

ئیباس وتی: ئەگەر هەندێك ئاوت بەسەردا بکەم ئایا زیانت پێدەگەیەنێت؟

پیاوەکە وتی: نەخێر.

ئیباس وتی: ئەی ئەگەر هەندێك خۆڵت بەسەردا بکەم زیانت پێدەگەیەنێت؟

پیاوەکە وتی: نەخێر.

ئیباس وتی: ئەی ئەگەر ئاو و گڵەکە تێکەڵ بکەم و بلۆکی قوڕینی لێ دروست بکەم پاشان بلۆکەکان بەسەرتدا دەم زیانت پێ دەگەیەنێت؟

پیاوەکە وتی: بەڵێ وە لەوانەیە بمکوژێت.

ئیباس وتی: دەی ئەویش وەکو ئەوە وایە.

* بە ئیبن عەباسیان وت: کێ هەموو زانستەکان دەزانێت؟
وتی: هەموو خەڵك.

* جاحظ دەڵێت: پیاوێکی ڕەزاقورسم هاتە لا وتی: بیستومە کە تۆ هەزار وەڵامی بێدەنگکەرت هەیە هەندێکیانم فێر بکە.
وتم: باشە.
وتی: ئەگەر پیاوێك پێی وتم ڕەزا قورس چی پێ بڵێم؟
وتم: پێی بڵێ ڕاست دەکەیت.

* ئافرەتێك لای قازی شکاتی لە هاوسەرەکەی کرد بەوەی کە کەم سەرجێیی لەگەڵ دەکات.
قازی وتی: من شەرم دەکەم کە ئافرەت باسی شتێکی وا بکات.
ئافرەتەکە وتی: بۆچی حەزم لە شتێك نەبێت ئەی قازی کە دایکت حەزی لێ بووە، بەڵکو خوا کوڕێکی باشی وەك تۆم بداتێ.

* یەکێك بە ئییاسی کوڕی موعاویەی وت: بۆچی سەرسامیت بە قسەکانی خۆت؟
ئییاس وتی: تۆ سەرسام نیت بە قسەکانی من؟
پیاوەکە وتی: بەڵێ سەرسامم.

ئیياس وتی: دەی من لەپێش ترم كە سەرسام بم بە قسەكانی خۆم.

پیاوەكە وتی:ئەی بۆچی پەلە دەكەیت لە بڕیارداندا؟

ئیياس پێی وت: دەستت چەند پەنجەی هەیە؟

پیاوەكە وتی: پێنج.

ئیياس وتی: بۆ پەلەت كرد لە وەڵامدانەوە؟

پیاوەكە وتی: ئەوە شتێكە لێی دڵنیام پێویست ناكات بوەستم.

ئیياس وتی: دەی ئەوە وەڵامی منیشە بۆ تۆ.

* دادوەر بە تاوانبارێكی وت: باشە شەرم ناكەیت ئەوەندە دێیت بۆ دادگا؟

تاوانبارەكە وتی: بەڵام جەنابت لە من زیاتر دێیت؟

* پیاوێك داوای لە ئافرەتێك كرد داوێن پیسی لەگەڵ بكات بەڵام ئافرەتەكە ڕازی نەبوو، دوای ئەوەی پیاوەكە نائومێد بوو بە ئافرەتەكەی وت: من تەنها دەمەویست تامت بكەم بزانم تۆ خۆشتری یان خێزانم.

ئافرەتەكە یەكسەر وتی: بڕۆ پرسیار لە هاوسەرەكەم بكە ئەو تامی هەردوكمانی كردووە.

* هەژارێك لە دەرگایماڵی زانایەكی نەحوی دا، زاناكە وتی: كێیە؟

وتی: هەژارێكە.

زاناكە وتی: (لینصرف ) واتە: بابڕوات.
هەژارەكە وتی: ناوم (أحمد)ە، وە أحمد (ممنوع من الصرف)ـە.
زاناكە بە خزمەتكارەكەی وت: كەسرەیەك بدە بە سیبویە.

* بە ئیبن موبارەكیان وت: بۆچی غەیبەتی كەس ناكەیت؟
وتی: ئەگەر غەیبەتی كەسم كردبا غەیبەتی باوكی خۆمم دەكرد ئەو لە هەموو كەس لەپێشترە چاكەكانی منی بۆ بچن.

* پیاوێك لە گوندێك وتارێكی خوێندەوە بۆ پشتیوانی كردنی حیزبی كرێكاران لە كۆتاییدا وتی: ئایا لەدوای ئەوە هیچ كەسێك هەیە بەرپەرچی ئەوە بداتەوە كە حیزبی كرێكاران باشترە لە پارێزگاران؟
دوای ئەوەی ئەو قسەیەی كرد یەكسەر كەرێك زەڕاندی هەموو ئامادەبووان پێكەنین.
پیاوەكە وتی: ئێستا بۆتان سەلما كە تەنها كەرەكان بەرپەرچی ئەوە دەدەنەوە.

* موعاویە بە (سعید بن مرّة)ی وت: تۆ سەعیدیت؟ (سعید واتە: ئاسودە، خۆشحاڵ).
سەعید وتی: سەعید پێشەوای باوەڕدارانە (موعاویە)، من كوڕی (مرّة)م.

* مەئمون بە سەیید کوڕی ئەنەسی وت: تۆ سەییدیت؟ ( سید واتە: گەورە، بەڕێز).
سەیید وتی: سەیید پێشەوای باوەڕدارانە (مەئمون)، من کوڕی ئەنەسم.

* هیشامی کوڕی عبدالملك لە کەعبەی پیرۆز بە پیاوێکی وت: پێویستیت چییە بۆ بۆت جێبەجێ بکەم؟
پیاوەکە وتی: لە ماڵی خوا داوا لە کەس ناکەم جگە لە خوا.

* یەکێك بە هاوڕێکەی وت: تۆ باخچەی دونیایت.
هاوڕێکەی وتی: تۆش ئەو ڕوبارەی کە ئەم باخچەیە ئاوی لێ دەخواتەوە.

* پاشای ڕۆم نامەیەکی درێژی بۆ ڕەشید نارد کە تێیدا هەڕەشەی لە ڕەشید کردبوو، ڕەشید وەڵامی دایەوە: وەڵامەکە ئەوەیە کە دەیبینیت نەك ئەوەی دەیخوێنیتەوە.

* پیاوێك جەمازی وت: حەز دەکەم شەیتان ببینم.
جەماز وتی: بڕۆ سەیری ئاوێنە بکە دەیبینیت.

* عبدالرحمن کوڕی حەسان  بە عطاء کوڕی ئەبو صەیفی وت: ئەگەر لە بەقیع گۆزەیەکی پڕ لە شەڕابت دۆزیەوە چی لێ دەکەیت؟

عطاء وتی: لەناو بازرگانەکاندا بە دوای خاوەنەکەیدا دەگەڕێم ئەگەر هی ئەوان نەبوو ئەوا هی تۆیە.

* ڕۆژێکیان مەنصور بە سوفیانی کوڕی سەعید گەیشت و پێی وت: ئەی باوکی عبدالله چی وات لێدەکات نەیەیتە لامان؟

سوفیان وتی: خوای باڵادەست قەدەغەی کردووە لێمان کاتێك دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ الهود:١١٣.

واتە: نەکەن مەیلی دڵتان لەگەڵ ئەوانە بێت کە ستەمیان کردووە، چونکە ئەو کاتە ئاگر دەتانسوتێنێت.

ڕۆژێکی تر مەنصور بە دوای سوفیانیدا ناردەوە ئەویش هات بۆ لای،

مەنصور وتی: داواکاریت چییە بۆتی جێبەجێ بکەم؟

سوفیان وتی: جێ بەجێی دەکەن؟

مەنصور وتی: بەڵێ.

سوفیان وتی: داواکاریم ئەوەیە جارێکی تر نەنێرن بە دوامدا تا بۆ خۆم دێم وە هیچم بۆ نەنێرن تا بۆ خۆم داوای دەکەم، پاشان ڕۆیشتە دەرەوە.

* پیاوێك بە بەتلیمۆسی وت: چەند باشە مرۆڤ ئارام بگرێت لەسەر ئەوەی حەزی لێیەتی.

ئەویش وەڵامی دایەوە وتی: وە لەوە باشتر ئەوەیە حەزی لە شتێك نەبێت جگە لەوەی پێویستی پێیەتی.

* پیاوێك مەدحی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکی کرد.
هیشام وتی: ئەی پیاو باش نییە مەدحی کەسێك بکەی لە ڕوی خوێدا.
پیاوەکە وتی: مەدحم نەکردویت بەڵکو بیری نیعمەتەکانی خوام خستیەوە کە بەسەرتدا ڕژاندوونی بۆ ئەوەی سەر لەنوێ سوپاسی بکەیتەوە.
هیشام وتی: ئەوە لە مەدح و ستایش باشترە، لەسەر ئەوە ڕێزی لێ گرت.

* لە پیاوێکی ڕەوانبێژیان پرسی: باشترین قسە چییە؟
پیاوەکە وتی: ئەو قسەیەی خێرا بە گوێت دەگات، هەروەها ماناکەشی بە دڵت دەگات.

* مەئمون پیاوێکی هێنا کە سزای مردنی لەسەر واجب بوو بوو، پیاوەکە وتی: دەمکوژیت ئەی پێشەوای باوەڕداران؟
مەئمون وتی: ڕاستی (الحق) دەتکوژێت.
پیاوەکە وتی: بەزەیت پێمدا بێتەوە.
مەئمون وتی: لەوە بەسۆزو بەزەیی تر نیم کە ئەوەی بەسەردا واجب کردوی.

* دەگێڕنەوە کە کاتێت سلێمانی کوڕی عبدالملك فەرمانی کرد بە ڕوخاندنی کەنیسەی مەریەم لە دیمەشق هرقل بۆی نوسی: فەرمانت

کردووە بە ڕوخاندنی کەنیسەی مەریەم، باوکت ئەم کەنیسەیەی بینی و نەیڕوخاند، ئەگەر تۆ ڕاست بیت ئەوا باوکت هەڵەی کردووە وە ئەگەر باوکت ڕاست بێت ئەوا تۆ هەڵەیت کە ئەم کەنیسەیە بڕۆخێنیت.

سلێمان وەڵامی دایەوەو بۆی نوسی: ﴿فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ وَكُلًّا آتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ الأنبياء: ٧٩.

واتە:ئێمە چارەسەری کێشەکەمان لە سولەیمان گەیاند، وە هەریەکە (لە داود و سلیمان)بەهرەوەرمان کردبوو لە حیکمەت و دانایی و زانست.

* بە دەشتەکی یەکیان وت: چەند منداڵت هەیە؟

وتی: پێنج کوڕم لای خوایەو سێ دانەشی لای منە.( مەبەستی ئەوە بوو پێنج کوڕی مردووەو سێی زیندوشی هەیە).

* دەگێڕنەوە کە ئیمپڕاتۆرێکی نەمسا بیستی کە لە ئیتاڵیا پیاوێك هەیە زۆر لەخۆی دەچێت بۆیە بانگهێشتی کرد بۆ ڤیەننا، کاتێك پیاوەکە هات و ئیمپڕاتۆر چاوی پێکەوت زۆر سەرسام بوو لەبەرئەوەی زۆر لەیەك دەچوون.

ئیمپڕاتۆر بە پیاوەکەی وت: تا ئێستا دایکت لە ڤیەننا ژیاوە؟

پیاوەکە وتی: نەخێر بەڵام باوکم ماوەیەکی زۆر لە ڤیەننا ژیاوە.

* عەلی کوڕی عیسا کە وەزیر بوو حەزی لێ بوو زیادەی بەسەر هەموو کەسێکەوە هەبێت، ڕۆژێکیان قازی ئەبو عەمرڕ هاتە لای کە کراسێکی نوێ و بە نرخی لەبەر بوو، وەزیر ویستی شەرمەزاری بکات وتی: ئەی ئەبو عەمرڕ ئەم کراسەت بەچەند کڕیوە؟

وتی: بە سەد دینار.

وەزیر وتی: من کراسم بە بیست دینار کڕیوە.

ئەبو عەمرڕ وتی: وەزیر خۆی جلەکان جوان دەکات پێویستی بە زیادەڕەوی نییە، بەڵام ئێمە بە جلەکانمان خۆمان جوان دەکەین بۆیە پێویستمان بەوەیە زیادەڕەوی تێدا بکەین.

* سوقڕات لە تەمەنی پیریدا خۆی فێری مۆسیقا دەکرد پێیان وت: باشە شەرم ناکەیت بە پیری خۆت فێری مۆسیقا دەکەیت؟

سوقڕات وتی: شەرمم لەوە زیاترە کە بە پیری نەزان بم.

* وتیان: باشە بۆچی داوا لە خوا دەکەین وەڵاممان ناداتەوە؟

وتی: لەبەرئەوەی بانگی ئێمەی کرد وەڵاممان نەدایەوە.

* دوو ئەمریکی چەپکە گوڵێکیان لەسەر گۆڕی هاوڕێکەیان دانا کاتێك ویستیان بڕۆن چاویان بە یابانیەك کەوت کە مستێك برنجی لەسەر گۆڕی

یەکێك لە نزیکەکانی دانا، ئەمریکیەکان بە گاڵتەوە پێیان وت: پێت وایە کەی مردووەکە هەڵدەستێت بۆ ئەوەی برنجەکە بخوات؟

یەکسەر وەڵامی دانەوە: ئەو کاتەی هاورێکەتان هەڵدەستێ بۆنی گوڵەکان بکات.

* پیاوێك بانگی مەئمونی کرد وتی: ئەی عبدالله.

مەئمون تورە بوو وتی: بە ناوی خۆمەوە بانگم دەکەیت؟

پیاوەکە وتی: ئێمە بەردەوام بەناوی خۆیەوە بانگی خوا دەکەین.

مەئمون بێدەنگ بوو پێویستیەکەی بۆ جێبەجێ کرد.

* جارێکیان فەرەزدەق بەلای ( زیاد الأعجم) دا تێپەری کە گۆرانی دەوت، پێی وت: قسەت کرد ئەی سونەت نەکراو.

زیاد وتی: دایکت چەند خێرا ئەمەی پێ وتی.

فەرەزدەق وتی: بەخوا وەڵامێکی دەمکوتکەر بوو.

* دەگێرنەوە رۆژێك حەجاج لە سەربازەکانی دوور کەوتەوەو چاوی بە پیاوێکی دەشتەکی کەوت و لێی پرسی: حەجاج کەسێکی چۆنە؟

دەشتەکیەکە وتی: ستەمکارو زۆردارە.

حەجاج وتی: سکاڵات لای عەبدولمەلیکی کوری مەروان لێ نەکردووە؟

دەشتەکیەکە وتی: ئەو ستەمکار ترو زۆردارترە نەفرەتی خوا لە هەردوکیان بێت.

کاتێك پیاوەکە لەو قسانەدا بوو سەربازەکانی حەجاج گەیشتنە لای دەشتەکیەکە بۆی دەرکەوت کە ئەوە حەجاجە پێی وت: ئەی فەرمانڕەوا ئەو نهێنیە لە نێوان خۆم و خۆت دایە کەس نایزانێت تەنها خوا نەبێت.

حەجاج پێکەنی و چاکەی لەگەڵ کردو پاشان جێی هێشت.

* پاشایەك بە لای سوقراتدا ڕۆیشت کە خەوی لێ کەوتبوو، بە قاچی خەبەری کردەوەو وتی: هەستە.

سوقرات بەبێ ترس و بێ ئەوەی لا بکاتەوە بە لایدا هەستا.

پاشاکە وتی: ئایا نامناسیت؟

سوقرات وتی: نەخێر بەڵام سیفەتێکی ئاژەڵانت تێدایە لەبەرئەوەی وەك ئاژەڵ بە قاچ خەبەرت کردمەوە.

پاشا تورە بوو پێی وت: ئەم قسەیەم پێ دەڵێیت لە کاتێکدا تۆ بەندەی منیت.

سوقرات وتی: تۆ بەندەی بەندەی منی.

وتی: چۆن؟

سوقرات وتی: تۆ بەندەی ئارەزووەکانتی منیش بەسەر ئارەزووەکانمدا زاڵم و کردونم بە بەندەی خۆم.

* کچێك بە دەست کوڕێکەوە دەیناڵاند بۆ هەر کوێ بڕۆیشتایە دوای دەکەوت، ڕۆژێکیان کچەکە وەستا تا کوڕەکە لێی نزیك بوویەوە پاشان پێی وت: بۆچی دوام دەکەویت؟
کوڕەکە وتی: من دەتناسم، توخوا یەکەمجار تۆم لە کوێ بینی؟
کچەکە یەکسەر وتی: لە نەخۆشخانەی دەرونی لەبەرئەوەی من لەوێ پەرستارم.

* پیاوێك بە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی وت: ئێمە باشین تا خوا تۆ بهێڵێت.
عومەر وتی: تۆ باشیت تا ئەو کاتەی لە خوا بترسیت.

* عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان دەرگایەکی بۆ مزگەوتی ئەقصا دروست کرد، حەجاجیش دەرگایەکی تری لە بەرامبەر دروست کرد، هەورە تریشقەیەك هات و دەرگاکەی عەبدولمەلیکی سوتاندو دەرگاکەی حەجاج وەك خۆی مایەوە، عەبدولمەلیك ئەوەی لەسەر دڵی گران بوو، حەجاج بۆی نوسی: نمونەی من و نمونەی گەورەم پێشەوای باوەڕداران وەك نمونەی کوڕەکانی ئادەم وایە کە قوربانیان کردو لە یەکێکیان وەرگیراو لەوەی تریان وەرنەگیرا، ئەمە خەم و پەژارەی لە عەبدولمەلیك دوور خستەوە.

( کوڕەکانی ئادەم هابیل و قابیل قوربانیان کرد، قوربانیەکەی هابیل وەرگیراو ئاگرێك دابەزیو قوربانیەکەی خوارد، قوربانیەکەی قابیلیش قبوڵ نەکراو وەك خۆی مایەوە).

* دەگێڕنەوە کە ئەشعەب بەلای چەند کەسێکدا تێپەڕی کە خەریکی نان خواردن بوون پێی وتن: السلام علیکم ئەی ڕەزیلەکان.
وتیان: بەخوا ئێمە ڕەزیل نین بەڵکو بەخشندەین.
وتی: خوایە من درۆزن بم ئەوان ڕاستگۆ بن، لەگەڵیان دانیشت و وتی ئەوە چی دەخۆن وە یەکسەر دەستی کرد بە نان خواردن.
وتیان: ژەهر.
وتی: ژیان لە دوای ئێوە تامی نییە، هەر بەردەوام بوو لە خواردن و وازی نەهێنا.
وتیان: باشە تۆ هیچ یەکێك لە ئێمە دەناسیت؟
وتی: بەڵێ ئەوە، ئاماژەی بە خواردنەکە کرد.

* باقلانی ئەو کەسە ڕەوانبێژەیە کە زۆرێك لە سەرچاوەکان باسی زمان پاراوی و زیرەکی و خێرایی وەڵامدانەوەو دەمکوتکردنی بەرامبەرەکەی و بەهێزی بەڵگەکانی دەکەن.
( عضد الدولة ) ساڵی ٣٧١ی کۆچی بە سەردانێکی ڕەسمی ناردی بۆ لای پاشای ڕۆم، کاتێك گەیشتە لای پاشا پێیان وت دەبێت لەبەردەمی پاشا

زەوی ماچ بكەیت ئەویش ڕەتی كردەوە، وتیان: ڕێگەیەكی ترت نییە بۆ چوونە لای پاشا دەبێت ئەوە هەر بكەیت بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی كە نایكات، پاشا فەرمانی كرد كە دەرگایەكی بچوك دروست بكەن و لەوێوە بێتە ژوورەوە بۆ لای پاشا بۆ ئەوەی كاتێك دێت خۆی نەوی بكات و لە شێوەی ڕكوع بێتە ژوورەوەو ئامادەبووان وابزانن كە زەوی ماچ كردووە، باقلانی كاتێك دەرگاكەی بینی زانی كە پاشا مەبەستی چییە بۆیە پشتاوپشت ڕۆیشتە ژوورەوە، پاشا تێگەیشت كە كەسێكی زیرەكەو فێڵی لێناكرێت.

پاشان دانیشتنێكی بۆ ڕێكخرا لەگەڵ گەورەی قەشەكان، باقلانی پێی وت: چۆنیت ماڵ و منداڵت چۆنن؟

گەورەی قەشەكان سەرسام بوو پێی وت: ئەوەی تۆی ناردووە لە نامەكەیدا ئاماژەی بەوە كردووە كە تۆ زانایەكی گەورەیت چۆن نازانیت كە قەشەكان خۆیان بە دوور دەگرن لە هاوسەرگیری كردن و منداڵ بوون ئێمە پێمان وایە هاوسەرگیری پیسییە؟

باقلانی وتی: چۆن دەڵێن هاوسەرگیری پیسییە وە دەڵێن خوا هاوسەرگیری لەگەڵ مەریەمدا كردووەو عیسا كوڕی خوایە، ئایا ئێوە پاكترن لە خوای باڵادەست؟

گەورەی قەشەكان هیچ وەڵامێكی پێ نەبوو، پاشان وتی: ئایا دەزانیت چی وتراوە دەربارەی خێزانی پێغەمبەرەكەتان، ویستی تانە لە عائشە

بدات له‌سه‌ر ئه‌و گومانه‌ی كه‌ دووڕووه‌كان دروستیان كرد بۆ دایكی باوه‌ڕداران.

باقلانی وتی: عائشه‌ خێزانی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌مان و مه‌ریه‌م دایكی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌تان هه‌ردوكیان بوختانیان بۆ كراوه‌، به‌ڵام خێزانی پێغه‌مبه‌رمان منداڵی نه‌بوو وه‌ دایكی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌تان له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی كه‌ شووی نه‌كردبوو به‌ منداڵێكه‌وه‌ هاته‌وه‌ كه‌ هه‌ڵی گرتبوو، خوا هه‌ردووكیانی به‌ پاك دانا و ئێمه‌ش هه‌ردوكیان به‌ پاك داده‌نێین به‌ڵام سه‌یر له‌وه‌دایه‌ كه‌ ئێوه‌ تاوان ده‌خه‌نه‌ پاڵ ئه‌وه‌ی كه‌ منداڵی نه‌بوو وه‌ ئه‌وه‌ به‌ پاك داده‌نێن كه‌ منداڵی بوو.

گه‌وره‌ی قه‌شه‌كان بێده‌نگ بوو هیچ قسه‌یه‌كی تری نه‌كرد.

* یه‌كێك له‌ پاشاكان به‌یانیه‌كی زوو له‌ ماڵ ڕۆیشته‌ ده‌ره‌وه‌، له‌ ڕێگه‌دا ئه‌سپه‌كه‌ی هه‌ڵه‌نگوت و پاشا له‌سه‌ر پشتی ئه‌سپه‌كه‌ كه‌وته‌ خواره‌وه‌، كاتێك سواری ئه‌سپه‌كه‌ی بوویه‌وه‌ پیاوێكی بینی كه‌ به‌ره‌و لای دێت، پاشا وتی: ئه‌و پیاوه‌ كه‌سێكی شومه‌ كاتێك بینیم له‌ ئه‌سپه‌كه‌م كه‌وتمه‌ خواره‌وه‌ بۆیه‌ ده‌بێت سه‌ری ببه‌ڕێنرێت.

كاتێك پیاوه‌كه‌ گوێی له‌مه‌ بوو به‌ پاشای وت: قسه‌یه‌كم هه‌یه‌ ده‌توانم بیڵێم؟

پاشا وتی: بیڵێ.

پیاوەکە وتی: توخوا کاممان شومترین من یان تۆ، تۆ منت بینی لە ئەسپەکەت کەوتیتە خوارەوەو بە سەلامەتی هەستایتەوە منیش تۆم بینی فەرمانی کوشتنم بۆ دەرچوو، دەی کاممان شومترین؟

* بە دەشتەکی یەکیان وت: ئەم وشترە هی کێیە؟
وتی: هی خوایە لە دەستی مندایە.

* ڕۆژێکیان ڕەشید لە حومەیدی طوسی تورە بوو بانگی پیاوکوژێکی کرد، حومەید دەستی کرد بە گریان.
ڕەشید وتی: بۆچی دەگریت؟
حومەید وتی: بەخوا ئەی پێشەوای باوەڕداران لە مردن ناترسم لەبەرئەوەی سەرەنجامی هەمووماننە، بەڵام لەبەرئەوە گریام پێم ناخۆشە کە دونیا جێ بهێڵم و پێشەوای باوەڕداران لێم تورە بێت.
خەلیفە پێکەنی و لێی خۆش بوو.

* خەلیفە بە پیاوێکی نابینای وت: چ شتێك لەسەرت قورسە بەهۆی نابینایەکەتەوە؟
نابیناکە وتی: نەبینی تۆ ئەی پێشەوای باوەڕداران.

* یەکێك بە هاوڕێکەی وت: تۆ هیچ نازانیت تەنها قسە کردن نەبێت.

هاورێکەی وەڵامی دایەوە وتی: تۆ هەر هیچ نازانیت.

* قوتابییەك بە مامۆستاکەی وت: ئایا کەس سزا دەدەیت لەسەر شتێك کە نەیکردبێت؟

مامۆستاکە وتی: بێگومان نەخێر.

قوتابییەکە وتی: باشە کەواتە لەمەودوا ئەرکیماڵەوە نانوسم.

* لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفیزیۆنیدا لەگەڵ شێخێك کە لە کەناڵێکی ئەمریکی پێشکەش کرا، پێشکەشکارەکە پرسیاری کرد: بۆچی ئێوە ڕێگە بە ئافرەت نادەن ئۆتۆمبیل لێ بخورێت؟

شێخەکە وتی: ئایا سەرۆکی ئەمریکا ئۆتۆمبیل لێدەخورێت؟

پێشکەشکارەکە وتی: نەخێر، ئەگەر خۆشی بیەوێت ڕێگەی پێ نادرێت.

شێخەکە وتی: بۆچی؟

پێشکەشکارەکە وتی: بۆ پارێزگاریکردن لێی وە هەروەها وەك ڕێزێك بۆی یەکێك ئۆتۆمبیلەکەی بۆ لێدەخورێت.

شێخەکە وتی: ئێمەش لەبەرئەوە ڕێگە بە ئافرەت نادەین ئۆتۆمبێل لێبخورێت بۆ ئەوەی پارێزراو بێت وە هەروەها وەك ڕێزێك بۆی براکەی یان هاوسەرەکەی یان باوکی بۆی لێدەخورێت.

* خێزانی ئەسکەندەری سێیەم قەیسەری ڕوسیا بڕیارێکی ڕەسمی خوێندەوە کە بە خەتی هاوسەرەکەی نوسرا بوو (لێبوردن ئەستەمە، نەفی بکرێت بۆ سیبریا)، خێزانەکەی شوێنی فاریزەکەی گۆڕی و بڕیارەکە بەم شێوەیەی لێهات: (لێبوردن، ئەستەمە نەفی بکرێت بۆ سیبریا) بەهۆی ئەمە زیندانیەکە ئازاد کرا کە بڕیار بوو نەفی بکرێت و دوور بخرێتەوە بۆ سیبریا.

* ڕۆژێکیان موعاویە وتی: ئەی خەڵکینە خوای باڵادەست ئێمەی قورەیشی خۆشویستووە بە سێ شت، بە پێغەمبەرەکەی فەرمووو: ﴿وأنذِر عَشِرَتَكَ الأَقرَبين﴾ واتە: خزم و کەسە زۆر نزیکەکانت بترسێنە.
ئێمە خزم و کەسە زۆر نزیکەکانی ئەوین.
وە فەرمویەتی: ﴿وَإِنَّه لَذِكرٌ لَكَ وَلِقَومِكَ﴾ واتە: وە بێگومان ئەو قورئانە هۆی ناوداریە بۆ خۆت و بۆ گەلەکەت.
ئێمە گەلەکەی ئەوین.
وە فەرمویەتی: ﴿لإِلافِ قُرَيش إِلافِهِم﴾ واتە: (لەشکری ئەبرەهەی لەناو برد) لەبەر هۆگری قورەیش.
ئێمەین قورەیش.
پیاوێك لە پشتیوانەکان وەڵامی دایەوەو وتی: وە خوای باڵادەست بە پێغەمبەرەکەی فەرموو:﴿ وَكَذَّبَ بِهِ قَومُكَ وَهُوَ الحَقُّ﴾ واتە: گەلەکەت باوەڕیان بەم قورئانە نەکرد کە هەر ئەوە حەق و ڕاست.

ئێوە گەلەکەی ئەون.

وە فەرموی: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ابنُ مَريَمَ مَثَلاً إِذَا قَومُكَ مِنهُ يَصِدُّونَ﴾ واتە: وە کاتێ عیسای کوڕی مەریەم بە نمونە هێنرایەوە دەست بەجێ گەلەکەت دەیکەنە هاوارو قیڕەی خۆشی(وا دەزانن قسەی ئەوان بەسەر قسەی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم سەرکەوتووە).

وە ئێوە گەلەکەی ئەون.

وە فەرمویەتی: ﴿ وَقَالَ الرَسولُ يارَبِّ إِنَّ قَومِي اتَّخَذُوا هَذَا القُرآنَ مَهجُورا ﴾ واتە: وە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی پەروەردیگارم بەڕاستی قەومەکەم (قوڕەیش) ئەم قوڕئانەیان واز لێ هێناوەو گوێی پێ نادەن.

وە ئێوەن گەلەکەی ئەو (قوڕەیش).

پاشان وتی: سێ بە سێ ئەگەر زیاتر بڵێی ئێمەش زیاتر دەڵێین.

* لەسەردەمی خەلیفە موتەوەکیل ئافرەتێکیان هێنا بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە پێغەمبەرە، خەلیفە پێی وت: تۆ کێیت؟

ئافرەتەکە وتی: من فاتیمەی پێغەمبەرم.

خەلیفە وتی: ئایا باوەڕت بەوە هەیە کە پێغەمبەر محمد (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی؟

ئافرەتەکە وتی: بەڵێ.

خەلیفە وتی: دەی محمد (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی: (لا نبي من بعدي) واتە: هیچ پێغەمبەرێك لە دوای من نییە.

ئافرەتەکە وتی: ئەو مەبەستی پێغەمبەری پیاوە، ئەگەر مەبەستی ئافرەت بوایە دەیفەرموو (لا نبیة من بعدي).
خەلیفە ئەوەندە پێکەنی کە دەموچاوی خۆی داپۆشی پاشان بەوانەی وت کە لە دەوروبەری بوون: من قسەم نەما ئەگەر ئێوە شتێکتان هەیە بیڵێن.

* دەگێڕنەوە کە خزمەتکارێك گەورەکەی شتێکی پێدا بۆ ئەوەی بیخوات پاشان پێی وت: پارچەیەکم بدەیە بیخۆم، کاتێك خواردی بینی تاڵە، بە خزمەتکارەکەی وت ئەوە زۆر تاڵە چۆن خواردت؟
خزمەتکارەکەی وتی: گەورەم شتی شیرینم زۆر لە دەستی تۆ خواردووە، تەنها ئەم جارە تاڵ بووە حەزم نەکرد نیشانتی بدەم کە تاڵەو ڕقم لێیەتی.

* پیاوێك ڕۆیشتە لای خەلیفە، خەلیفە سەیری قاچەکانی کردو وتی: ئەوە چ قاچێکن، ئای ئەگەر ئەوە هی کەنیزەکێك دەبوون.
پیاوەکە وتی: بەڵام لەسەر سمتێکی وەك سمتی تۆ دەبوون.
خەلیفە وتی: یەك بە یەك بەڵام تۆش بێ ویژدانتر بوویت.

* هارونە ڕەشیدو خێزانەکەی لەسەر هەندێك شت بوو بە مشتومڕیان، هارون لە کاتی قسە کردندا وتی: تەڵاقم کەوتبێت ئەگەر من یەکێك نەبم لە ئەهلی بەهەشت، دواتر هارون پەشیمان بوویەوە لە قسەکەی و ترسا

لەوەی تەڵاقی کەوتبێت هەمووان دڵگران بوون، ڕەشید زانایانی ئاینی کۆکردەوەو پرسیاری لێ کردن هیچ یەکێك نەیتوانی بڵێت تەڵاقت نەکەوتووە، ڕەشید بۆ هەموو شارەکان نوسراوی ناردو بانگهێشتی زانایانی کردو هاتن و هەرکەیان وەڵامێکی جیای دایەوە، یەکێك لە زاناکان ناوی لیث کوڕی سەعد بوو کە خەڵکی میسڕ بوو وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران قورئانێك بێنەو سوڕەتی (الرحمن) بخوێنە، خەلیفە دەستی بە خوێندن کرد کاتێك گەیشتە ئەم ئایەتە ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ﴾ واتە: وە بۆ ئەو کەسەش کە لە مەقامی پەروەردیگاری خۆی ترسابێ دوو باخی خۆش هەیە.

زاناکە وتی: بوەستە ئەی پێشەوای باوەڕداران، کاتێك خەلیفە وەستا وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران تۆ لە مەقامی پەروەردیگارت دەترسیت؟

خەلیفە وتی: بەڵێ سوێند بەخوا.

زاناکە وتی: کەواتە تۆ بەهەشتیت هەروەك چۆن خوا لە کتێبی خۆیدا باسی کردووە.

ئەمە هەموانی دڵخۆش کردو ڕەشید خەڵاتێکی گەورەی کرد.

* عائشە خوا لێی ڕازی بێت مەڕێکی سەربڕی و هەموو گۆشتەکەی کرد بە خێر تەنها شانێکی نەبێت.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: چیت هەڵگرتووە؟

عائشە وتی: هیچی نەماوەتەوە تەنها شانێکی نەبێت.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: هەمووی ماوەتەوە تەنها شانێکی نەبێت؟

* بە سوقراتیان وت: بۆچی تۆیان بە داناترینی یۆنان هەڵبژاردووە؟
سوقرات دەستی بە ڕیشیدا هێناو بە ئارامیەوە وتی: لەوانەیە لەبەرئەوە بێت کە من تاکە کەسیانم کە دەزانێت کە هیچ نازانێت.

* باوك: کوڕم بۆچی درۆ دەکەیت.. درۆ کردن عەیبە.. دەزانیت داهاتوت چی دەبێت ئەگەر یەکێك بیت لە درۆزنان؟
کوڕ: بەڵێ باوکە دەبمە بەڕێوەبەری بەشی ڕیکلام لە کۆمپانیاکەتدا.

* مامۆستا: پایتەختی هیندستان دەکەوێتە کوێ؟
قوتابی: دەکەوێتە سەر ئەو نەخشەیەی کە لە ژووری بەڕێوەبەر هەڵواسراوە.

* فەرمانڕەوایەك پیاوێکی هێنا کە تاوانێکی کردبوو فەرمانی کرد لێی بدرێت.
پیاوەکە وتی: توسەری دایکت لێم خۆشبە.
فەرمانڕەواکە ڕازی نەبوو، بە قامچی وەشێنەکەی وت: لێیدە.
پیاوەکە وتی: توخاتری چاوی دایکت لێم خۆشبە.

فەرمانڕەواکە وتی: لێیدە.
پیاوەکە وتی: توخاتری ڕومەتی دایکت لێم خۆشبە.
فەرمانڕەواکە وتی: لێیدە.
پیاوەکە وتی: توخاتری مەمکی دایکت لێم خۆشبە.
فەرمانڕەواکە وتی: لێیدە.
پیاوەکە وتی: توخاتری ناوکی دایکت لێم خۆشبە.
فەرمانڕەواکە وتی: بەسە وازی لێبێنە تا زیاتر نەچۆتە خوارەوە.

* لە کوفە پیاوێك هاتە لای خەلیفە مەئمون وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران گەلەکەم ناردومی بۆ ئەوەی شکات لە فەرمانڕەوای شارەکەمان بکەم کە کەسێکی ستەمکارەو لای بدەیت.
خەلیفە وتی: درۆیە فەرمانڕەواکەتان کەسێکی باش و دادپەروەرە.
پیاوەکە وتی: پێشەوای باوەڕداران ڕاستی فەرموو من درۆم کرد، پاشان وتی: پێشەوای باوەڕداران کەس لە تۆ لە پێشتر نییە کە دادپەروەر بێت ئەوە ماوەیەکە لای ئێمە فەرمانڕەوایە بیگوازەوە بۆ شارێکی تر با ئەوانیش لە باشی و دادپەروەریەکەی بێبەش نەبن.
خەلیفە وتی: باشە هەستە ئەوە لامبرد.

* ئافرەتێك بە هاوسەرەکەی وت: تۆ مێشکی کچەکە تێك دەدەیت، من پێم وتووە بنچینەی مرۆڤ مەیمونە، کەچی تۆ وتووتە مرۆڤ لە ئادەمە.

هاوسەرەکەی وتی: تۆ دەربارەی کەسوکاری خۆت هەواڵت پێداوەو منیش دەربارەی کەسوکاری خۆم هەواڵم پێداوە.

* بە دەشتەکی یەکیان وت: بۆچی ناچیت بۆ جیهاد؟
وتی: بەخوا من لەسەر جێگە لە مردن دەترسم جا چۆن بۆ خۆم بەرەو لای دەچم.

* کڕیار: تاکەی چاوەڕێی ئەو نیو مریشکە بکەم کە دوام کردووە؟
فرۆشیار: تا ئەو کاتەی کڕیارێکی تر دێت داوای نیو مریشك دەکات، لەبەرئەوەی ناتوانین نیو مریشك سەرببڕین.

* مامۆستا بە قوتابیەکانی وت: ئێوە داهاتووی ئەم گەلەن، ئێوە گڵۆپن داهاتوو ڕوناك دەکەنەوە.
قوتابیەك بەڕێزەوە دەستی بەرز کردەوە پاشان ئاماژەی بە قوتابیەکەی تەنیشتی کرد کە خەوی لێکەوتبوو وتی: بەڵام مامۆستا ئەم گڵۆپە سوتاوە.

* مامۆستا: حەزت لە چ شتێکی قوتابخانەیە؟
قوتابی: زەنگ.

* بە دەشتەکی یەکیان وت: ئایا ژنت هێناوە؟
وتی: من ئەگەر توانیبام خۆم تەڵاق بدەم ئەوا خۆم تەڵاق دەدا.

* جاحظ دەڵێت: کەنیزەکێکم بینی لە بازاڕی بەغدا کە خاڵێکی ڕەشی لەسەر کوڵمەی بوو، پێم وت: ناوت چییە؟
وتی: مەککە.
وتم: الله أكبر حەج نزیك بوەتەوە ئایا ڕێگەم دەدەیت بەردە ڕەشەکە ماچ بکەم؟
وتی: دوور کەوە لێم، ئایا ئەم وتەیەی پەروەردیگارت نەبیستووە کە دەفەرموێت:﴿ لَّم تَكُونُوا بَالغيةِ إِلَّا بِشِقِّ الأنفُسِ﴾.
واتە: ئێوە پێی نەدەگەیشتن تەنها بە ناڕەحتیەکی زۆر نەبێت.

* پیاوێك سەیری خێزانەکەی کرد کە بە قادرمەکاندا سەردەکەوت پێی وت: تەڵاق دراویت ئەگەر سەربکەویت وە تەڵاق دراویت ئەگەر دابەزیت وە تەڵاق دراویت ئەگەر بوەستیت.
ئافرەتەکە خێرا خۆی هەڵدایە سەر زەویەکە.
پیاوەکە وتی: ئەگەر ئیمام مالك مرد خەڵکی مەدینە پێویسیان پێت دەبێت.

* پیاوێك لای خه‌لیفه واثیق وه‌ستاو پێی وت: ئه‌ی پێشه‌وای باوه‌ڕداران به‌زه‌یت به خزمه‌كانتدا بێته‌وه‌و سیله‌ی ڕه‌حم جێبه‌جێ بكه‌و به‌زه‌یت به پیاوێكدا بێته‌وه له كه‌سوكاری خۆت.

خه‌لیفه وتی: تۆ كێی.. من ناتناسم؟

پیاوه‌كه وتی: من نه‌وه‌ی باپیرتم ئاده‌م.

خه‌لیفه وتی: خزمه‌تكار درهه‌مێكی بده‌یه.

پیاوه‌كه وتی: ئه‌ی پێشه‌وای باوه‌ڕداران چی له درهه‌مێك بكه‌م.

خه‌لیفه وتی: ئایا وا نازانیت ئه‌گه‌ر پاره‌و سامان به‌سه‌ر براكانت نه‌وه‌كانی باپیرمدا دابه‌ش بكه‌م له‌وانه‌یه ده‌نكه گه‌نمێكت به‌رنه‌كه‌وێت.

* كۆمه‌ڵێك دز به شه‌و چوونه ماڵی پیاوێكی هه‌ژار.

هه‌ژاره‌كه پێی وتن: ئه‌وه‌ی ئێوه به‌شه‌و به دوایدا ده‌گه‌ڕێن ئێمه به ڕۆژ به دوایدا گه‌ڕاین نه‌ماندۆزیه‌وه.

* پیاوێك پرسیاری له عه‌بدوڵڵای كوڕی عه‌باس كرد: چی ده‌ڵێیت ده‌رباره‌ی گۆرانی وتن ئایا حه‌ڵاڵه؟

عبدالله وتی: ناڵێم حه‌ڵاڵ ته‌نها به‌و شته نه‌بێت كه له قورئاندا باس كراوه كه حه‌ڵاڵه.

پیاوه‌كه وتی: ئه‌ی حه‌رامه؟

عبدالله وتی: ناڵێم حەرام تەنها بەو شتە نەبێت کە لە قورئاندا باس کراوە کە حەرامە.

عبدالله سەیری پیاوەکەی کرد کە نیشانەی شپرزە بوون بەسەر ڕوخساریەوە دیار بوو پێی وت: ئەگەر ڕەوا (الحق) و ناڕەوا (باطل) لە ڕۆژی دوایدا بهێنن ئایا گۆرانی وتن لەگەڵ کامیان دەبێت؟

پیاوەکە وتی: لەگەڵ ناڕەوا (باطل).

عبدالله وتی: کەواتە بڕۆ بۆ خۆت فەتوات بۆ خۆت دا.

* ئافرەتێك بە هاوسەرەکەی وت: تا ئێستا کەسم لە براکانی تۆ ناپیاوتر نەبینیوە.

پیاوەکە وتی: بۆچی؟

ئافرەتەکە وتی: لەبەرئەوەی ئەگەر بینیان بارودۆخت باشە ئەوا سەردانت دەکەن وە ئەگەر زانیان نەداریت ئەوا وازت لێ دەهێنن و هەر بەلاشتدا نایەن.

پیاوەکە وتی: بەخوا ئەوە لە گەورەییانە ئەو کاتەی زانیان دەتوانین پێشوازیان لێ بکەین سەردانمان دەکەن، وە ئەگەر زانیان توانامان نیە پێشوازیان لێ بکەین سەردانمان ناکەن.

* ڕۆژێکیان مەئمون سەری لەسەر کۆشی هاوسەرەکەی داناو خەوت، کاتێك خەوی لێ کەوت هاوسەرەکەی بە هێمنی سەری بەرز کردەوەو خستیە سەر سەرینێك و ڕۆیشتە دەرەوە.

کاتێك مەئمون لەخەو هەستا ترساو بانگی هاوسەرەکەی کرد، لە تزیکەوە وەڵامی دایەوە.

مەئمون وتی: من سەری خۆم تەسلیمی تۆ کرد کەچی تۆش ڕۆیشتیت و جێت هێشتم.

هاوسەرەکەی وتی: لەبەرئەوەی باوکم وا پەروەردەی کردووم کە لەگەڵ کەسی خەوتودا دانەنیشم وە لەلای کەسی دانیشتو نەخەوم.

* قوتابیەك هیچ ڕۆژێك دەرسی لەبەر نەدەکرد مامۆستاکە زۆری پێدەوت بێ سود بوو، ڕۆژێکیان مامۆستاکە لەسەر کڵاوی قوتابیەکە نوسی حمار (کەر) پاشان خستیە ناو کەوانەیەکەوەو بە قوتابیەکەی وت: ڕەشی نەکەیتەوە تا کەسوکارت دەیبینێت.

قوتابیەکە زۆر لەسەری گران بوو زۆر داوای لە مامۆستاکە کرد کە ڕەشی بکاتەوە بەڵام بێ سود بوو وتی: ئەوە سزای ئەوەیە کە چەند ڕووژە وانەکە لەبەر ناکەیت ئەوەندەی پێت دەڵێم بێ سودە وەك ئەوەی مێشکت نەبێت.

کاتێك قوتابیه‌که‌ نائومێد بوو له‌وه‌ی مامۆستاکه‌ ڕازی بکات که‌ ڕه‌شی بکاته‌وه‌ وتی: کێشه‌ نییه‌ ئه‌گه‌ر له‌ ماڵه‌وه‌ وتیان ئه‌وه‌ چییه‌ ده‌ڵێم ئه‌وه‌ واژۆی مامۆستایه‌.

مامۆستاکه‌ خێرا هێرشی کرده‌ سه‌ر کڵاوه‌که‌و لێی وه‌رگرت و ڕه‌شی کرده‌وه‌.

* سه‌رۆکی پێشوی جه‌زائیر کاتێك له‌گه‌ڵ ڕۆژنامه‌نوسێك گفتوگۆی ده‌کرد، ڕۆژنامه‌نوسه‌که‌ وتی: ڕۆژئاوای عه‌ره‌بی وه‌ك باڵنده‌یه‌ك وایه‌ مه‌غریب سه‌ره‌که‌یه‌تی تونس باڵه‌کانیه‌تی موریتانیا سنگیه‌تی لیبیا قاچه‌کانیه‌تی له‌ کۆتاییدا وتی جه‌زائیر کلکه‌که‌یه‌تی.

سه‌رۆکی جه‌زائیر وه‌ڵامی دایه‌وه‌و وتی: بیرت چوو بڵێیت باڵنده‌که‌ تاووسه‌.

* مه‌نصور ده‌ڵێت: یه‌حیای کوڕی أکثم کرا به‌ والی به‌صره‌ که‌ ته‌مه‌نی بیست و یه‌ك ساڵان بوو، خه‌ڵکه‌که‌ به‌ لاوازیان زانی و گاڵته‌یان پێ هات و ویستیان تاقی بکه‌نه‌وه‌ پێیان وت: ته‌مه‌نت چه‌نده‌؟

وتی: ته‌مه‌نی عتاب کوڕی ئه‌سیدم هه‌یه‌ کاتێك پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم کردی به‌ والی مه‌که‌.

* پیاوێك ڕۆیشتە كتێبخانەیەك بۆ ئەوەی كتێبێك بكڕێت، كتێبێكی بە دەستەوە گرت و بە خاوەنی كتێبخانەكەی وت: ئەم كتێبە باسی چی دەكات؟

كتێب فرۆشەكە وتی: نازانم.

پیاوەكە وتی: چۆن كتێبێك دەفرۆشیت كە نەتخوێندۆتەوەو نازانیت چی لەناو دایە؟

كتێب فرۆشەكە وتی: بۆ ئەگەر دەرمان فرۆش بم دەبێت تامی هەموو دەرمانەكان بكەم تا بزانم چی لەناو دایە؟!

* كاتێك حەجاج ملی هاوەڵانی عبدالرحمن كوڕی ئەشعەثی پەڕاند پیاوێك لە بەنی تەمیم هات و وتی: بەخوا حەجاج ئەگەر ئێمەش خراپەمان كردبێت بەوەی كە تاوانێكمان كردبێت تۆش چاكەت نەكرد بەوەی لێبوردە بیت و بمان بەخشیت.

حەجاج وتی: ئەو كەلاكانە پیاوێكی تێدا نەبوو قسەیەكی وا بكات.

وازی لە پیاوەكە هێناو ڕێگەی دا بڕوات.

* دەڵێن پیاوێك لە مەجلیسی مەنصوردا وتی: ئەو ئایەتەی پەروەردیگار كە دەفەرموێت:﴿ يَخرُجُ مِن بُطُنِهَا شَرَابٌ مُختَلِفٌ ألوَانُهُ﴾ النحل:٦٩. واتە: جا لەناو سكی ئەو هەنگانەوە شلەیەكی ڕەنگ جیاواز دێتە دەرەوە.

مەبەست پێی ئەهلی بەیت (بەنو هاشم)ـە، ئەوان هەنگن و شەڕابیش قورئانە.

پیاوێك وتی: خوا خواردن بکاتە ئەوەی کە لە زگی بەنو هاشم دێتە دەرەوە.

ئامادەبوان هەموو پێکەنین و پیاوەکە حەپەساو هیچ دەنگێکی نەکرد.

* باوکێك بە کوڕەکەی وت: ناپلیۆن کاتێك لە تەمەنی تۆدا بوو سەرکردایەتی جەیشێکی گەورەی دەکرد.

کوڕەکەی وەڵامی دایەوە: کاتێك لە تەمەنی تۆشدا بوو ئیمپڕاتۆر بوو.

* پیاوێك بە موتەنەبی شاعیری وت: لەدوورەوە بینیمیت وامزانی ژنیت!

موتەنەبی وتی: منیش لە دوورەوە تۆم بینی وامزانی پیاویت!

* دەگێڕنەوە کە دوو پیاو باوەڕدارێکیان هێنایە لای فیرعەون و وتیان: ئەو پیاوە باوەڕی بە موسا هێناوە.

فیرعەون بە دوو پیاوەکەی وت: کێ خواتانە؟

وتیان: تۆ.

پاشان بە پیاوە باوەڕدارەکەی وت: کێ خواتە؟

وتی: خوای من خوای ئەوانە.

فیرعەون وای زانی کە مەبەستی ئەوە، بە دوو پیاوەکەی وت: پیاوێکتان هێناوە کە باوەڕی بەوەیە کە من خوام و دەتانەوێت بیکوژم، پاشان هەردووکیانی لە سێدارە داو باوەڕدارەکە ڕزگاری بوو. ئەمە وەك مانای ئەم ئایەتەیە کە خوای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿ فَوَقَاه اللَّهُ سَيِّئات ما مَكَرُوا وَحَاقَ بِآلِ فِرعَونَ سُوءُ العَذاب﴾ الغافر:٤٥

واتە: جا خوای گەورە ئەم ئیماندارە ژیرەی پاراست لە پلانی خراپ و دڕندانەیان، دارو دەستەی فیرعەونیش سزایەکی زۆر سەختیان تووش بوو.

* پیاوێکی ئاگرپەرست مرد و قەرزێکی زۆری خەڵکی لەسەر بوو، هەندێك پیاو چوونە لای کوڕەکەی و پێیان وت: خانوەکەت بفرۆشەو هەندێك لە قەرزەکانی باوکت بدەوە.

کوڕەکەی وتی:ئەگەر خانوەکەم فرۆشت و قەرزەکانی باوکم دانەوە ئایا دەچێتە بەهەشت؟

وتیان: نەخێر.

وتی: دەی لێ گەڕێن با ئەو هەر لە جێگەی خۆی بێت و منیش لە جێگەی خۆم( لەناو خانوەکەم) بم.

* ڕۆژێکیان موعاویە وتاری دەدا وتی: خوای پەروەردیگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّ مِن شَيء إِلَّا عِندَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَعلُوم﴾ الحِجر:٢١.

واتە: هیچ شتێك نییە مەگەر خەزێنەکانی لای ئێمەیە وە نایئێرین و نایدەین بە ئەندازەی پێویست نەبێت.

پاشان وتی: ئەی لەسەر چی لۆمەم دەکەن ئەگەر کەمم پێ بەخشین؟

ئەحنەفی کوڕی قەیس وەڵامی دایەوە وتی: بەخوا ئێمە لەسەر ئەوە لۆمەت ناکەین کە لە خەزێنەکانی خوادایە، بەڵکو لەسەر ئەوە لۆمەت دەکەین کە خوا لە خەزێنەکانی بۆی دابەزاندوینە خوارەوەو تۆش خستوتە ناو خەزێنەی خۆتەوەو ناهێڵیت دەستمان پێ بگات.

موعاویە بێدەنگ بوو هیچ وەڵامێکی نەدۆزیەوە.

* دوای ئەوەی (غضبان القبعثري) لەلای (ابن الأشعث) گەڕایەوە بەسەر لمی کرماندا هاتەوە لەو پەڕی گەرمادا خێوەتە بچوکەکەی هەڵدا کاتێك لەو بارودۆخەدا بوو دەشتەکی یەك بە سواری وشترەکەی بەرەو لای هات کاتی نیوەڕۆ قرچەی گەرما بوو زۆر زۆر تینوی بوو وتی: السلام عليكم.

غضبان وەڵامی دایەوەو وتی: ئەوە سونەتەو وەڵامدانەوەی واجبە، سەرکەوتوو ئەو کەسەیە بیڵێت وە دۆڕاو ئەو کەسەیە وازی لێ بهێنێت، پێویستیت چیە؟

دەشتەکیەکە وتی: توشی قرچەی گەرما بووم وە زۆر تینومە ڕووم کردۆتە خێوەتەکەت بە هیوای بەرەکەتەکەی.

غضبان وتی: خێوەتێکی گەورە ترو باشترت نیشان بدەم؟

دەشتەکیەکە وتی: مەبەستت کامەیانە؟

غضبان وتی:خێوەتەکەی فەرمانڕەوا (ابن الأشعث).

دەشتەکیەکە وتی: ئەوە زەحمەتە پێی بگەم.

غضبان وتی خێوەتەکەی من زۆر زەحمەتترە پێی بگەی.

دەشتەکیەکە وتی: ناوت چییە؟

غضبان وتی: وەرگر.

دەشتەکیەکە وتی: نابەخشیت؟

غضبان وتی: ڕقم لەوەیە دوو ناوم هەبێت.

دەشتەکیەکە وتی: تۆ لە کوێوە هاتوویت؟

غضبان وتی: لەم سەر زەویەوە.

دەشتەکیەکە وتی: بۆ کوێ دەڕۆیت؟

غضبان وتی: بە ڕێگاکانیدا دەڕۆم.

دەشتەکیەکە وتی: ڕێگەم دەدەیت بێمە ژێر خێوەتەکەتەوە زۆر گەرمایە.

غضبان وتی: دوای خۆت فراوانترە.

دەشتەکیەکە وتی: تیشکی خۆر سوتاندمی.

غضبان وتی: دەسەڵاتم بەسەریدا نییە.

دەشتەکیەکە هەر پێیەکی بەرز دەکردەوەو دانەیەکی دادەناوە لەبەر گەرمی زۆری ژێر پێی پاشان وتی: قاچەکانم سوتان.

غضبان وتی: میزیان پێدا بکە سارد دەبنەوە.

دەشتەکیەکە وتی: من خواردن و خواردنەوەی تۆم ناوێت.

غضبان وتی: ئەوە شتێکە ئەگەر ڕۆحت بێتە دەر دەستت پێی ناگات.

دەشتەكیەكە وتی: تا ئێستا پیاوێكم نەبینیوە لە تۆ دڵڕەقتر بێت پەنام بۆ هێنای دەرت كردم وە ماوەیەكی زۆر بە قسە كردن لەبەر گەرما ڕات گرتم.

غضبان وتی: من هیچ پێویستیم بە قسەكردن نییە لەگەڵت، تۆ بۆ خۆت هاتیت.

دەشتەكیەكە وتی: توخوا پێم بڵێ ناوت چیە؟

غضبان وتی: غضبان القبعثري.

دەشتەكیەكە وتی: دوو ناوی ناپەسەند كە لە تورەیی دروست بوون، بەخوا من گومان دەبەم كە ڕەگ و ڕیشەو ڕەچەڵەكیشت خراپ بێت.

غضبان وتی: ناتوانم چاكی بكەم وە من پێی ڕازیم.

دەشتەكیەكە وتی: خوا لێت ڕازی نەبێت و تەمەنت درێژ نەكات، پاشان ڕۆیشت و ئەم ئەم شعرەی وت:

لا بارك الله في قوم تسودهم     إني أضنك – والرحمن – شيطاناً

أتيت قبته أرجو ضيافته     فأضهر الشيخ ذو القرنين حرمانا.

* پیاوێك ڕۆیشت بۆ بازاڕ بۆ ئەوەی كەرێك بكڕێت لە ڕێگەدا گەیشتە هاوڕێیەكی پرسیاری لێ كرد بۆ كوێ دەچیت؟

وتی: دەچم بۆ بازاڕ بۆ ئەوەی كەرێك بكڕم.

وتی: بڵێ إن شاءالله.

پیاوەکە وتی: لێرەدا پێویست بە إن شاءالله ناکات، پارەم لە گیرفاندایەو کەریش لە بازاڕ زۆرە.

کاتێك خەریکی کڕینی کەرەکە بوو پارەکەی لێ دزراو بە نائومێدی گەڕایەوە ماڵەوە.

لە ڕێگەدا گەیشتەوە هاوڕێکەی و پێی وت: چیت کرد؟

وتی: إن شاءالله پارەکەم لێ دزرا.

هاوڕێکەی وتی: لێرەدا پێویست بە إن شاءالله ناکات.

* بێباوەڕێك هاتە لای پێشەوا ئەبو حەنیفە و وتی: ئەی پێشەوا خوای خۆتت بینیوە؟

وتی: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردیگارم هیچ کەسێك ناتوانێت بیبینێت.

بێباوەڕەکە وتی: ئایا گوێت لە دەنگی بووە؟

ئایا هەستت پێ کردووە؟

ئایا بۆنت کردووە؟

ئایا دەستت لێ داوە؟

پێشەوا وتی: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردیگارم ﴿**لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ**﴾ الشورى:١١

واتە: هیچ شتێك نیە لە وێنەی ئەو زاتە، هیچ شتێك لەو ناچێت هەر ئەویش بیسەرو بینایە.

بێباوەڕەکە وتی: ئەگەر نەتبینیوەو هەستت پێ نەکردووە و بۆنت نەکردووە و دەستت لێ نەداوە، چۆن بۆت سەلما کە هەیە؟

پێشەوا وتی: ئایا عەقڵی خۆتت بینیوە؟

وتی: نەخێر

وتی: ئایا هەستت بە عەقڵت کردووە؟

وتی: نەخێر.

وتی: ئایاگوێت لە عەقڵت بووە؟

وتی: نەخێر.

وتی: دەستت لە عەقڵت داوە؟

وتی: نەخێر.

وتی: دەی تۆ عاقڵیت یان شێتیت؟

وتی: عاقڵم.

وتی: کوا عەقڵت؟

وتی: هەیە.

پێشەوا وتی: دەی بەم شێوەیەش خوا هەیە،خوا لەسەروی هەموو شتێکە و هیچ شتێکیش لە ژێر ئەو نیە.

* شای ئێران بانگهێشتی زانایانی سونەو شیعەی کرد بۆ ئەوەی لەیەکیان نزیک بکاتەوەو بڕوانێتە جیاوازیەکانی نێوانیان، زانایانی شیعە هەموویان

هاتن، بەڵام زانایانی سونە نەهاتن تەنها یەکێکیان نەبێت دوای هەموویان هات.

کاتێك هاتە ژورەوە پێڵاوەکانی خستبووە ژێر باڵی، زانا شیعەکان سەیریان کردو وتیان: بۆچی دێیتە ژورەوە بۆ لای شا و پێڵاوەکانت خستوّتە ژێر باڵت؟

زانا سونەکە وتی: بیستومە کە شیعە لەسەردەمی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) پێڵاویان دەدزی.

زانایانی شیعە وتیان: لەسەردەمی پێغەمبەردا ( صلی الله علیه وسلم ) شیعە نەبووە !

زانا سونەکە وتی: کەواتە گفتوگۆیەکە کۆتایی هات دەی ئێوە لەکوێوە هاتوون بەم دین و مەزهەبەتانەوە ؟!

* برایەکی خاوەن متمانە بۆی گێڕامەوە وتی: لە ڕیاز ڕۆیشتمە مزگەوتێك کاتێك سونەتی چوونە ناو مزگەوتم دەکرد لە تەنیشتمەوە پیاوێك نوێژی دەکرد بۆن جگەرەیەکی زۆری لێدەهات کە تەواو بێزاری کردم و خشوعم لەناو نوێژەکەمدا نەما. دوای ئەوەی سەلامم دایەوە سەیرم کرد پیاوێکە لەبەر زۆری جگەرە کێشانی لێوەکانی ڕەش بوون، لە دڵی خۆمدا وتم چاوەڕێ دەکەم هەتا نوێژەکەی تەواو دەکات پاشان قسەی لەگەڵدا دەکەم و ئامۆژگاری دەکەم بەڵام لە پڕ بینیم منداڵێك کە تەمەنی نزیك نۆ

ساڵان بوو هاتە ناو مزگەوت و لە تەنیشت ئەو پیاوە دانیشت و ئەم گفتوگۆیە لە نێوانیاندا ڕویدا.

منداڵەکە: مامە تۆ خەڵکی میسرێت؟

پیاوەکە: بەڵێ خەڵکی میسرم.

منداڵەکە: شێخ عبدالحمید کشك دەناسیت؟

پیاوەکە: بەڵێ دەیناسم.

منداڵەکە: ئەی شێخ محمد غەزالی؟

پیاوەکە: ئەویش دەناسم.

منداڵەکە: گوێ لە شریت و فەتواکانیان دەگریت؟

پیاوەکە: بەڵێ.

منداڵەکە: هەموو ئەو زاناو شێخانە دەڵێن جگەرە کێشان حەرامە بۆچی دەیکێشیت؟

پیاوەکە کە پەشۆکاوی پێوە دیار بوو وتی: نا نا جگەرە کێشان حەرام نییە.

منداڵەکە وتی: با حەرامە ئەوە نیە خوای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ الأعراف: ١٥٧.

پیاوەکە وتی: من ئایەتێکم دەوێت بڵێت جگەرە کێشان حەرامە.

منداڵەکە وتی: جگەرە کێشان حەرامە هەر وەك چۆن سێو حەرامە.

پیاوەکە بە تورەییەوە وتی: سێو حەرامە! تۆ بە حەزی خۆت شت حەڵاڵ و حەرام دەکەیت.

منداڵەکە وتی: ئایەتێکم بۆ بێنەوە بڵێت سێو حەڵاڵە.
پیاوەکە شپرزە بوو نەیدەتوانی قسە بکات پاشان دەستی کرد بە گریان و پاشان بە گریانەوە نوێژی دەکرد، دوای ئەوەی نوێژەکەی تەواو کرد رووی کردە منداڵەکەو پێی وت: سەیرکە کورم سوێند بەخوا جارێکی تر لە ژیانمدا جگەرە ناکێشمەوە.
ئەمە بەسەرهاتێکی ڕاستییە.. ئەوەی منی سەرسام کرد ئەوە بوو کە چۆن ئەو منداڵە توانی ئەم قسە بەهێزانە بکات بەتایبەتی لەم سەردەمەدا.

* وەزیرێك بەلای جوتیارێکی پیردا تێپەڕی کە خەریکی چاندنی دار خورمایەك بوو، سەلامی لێکردو پێی وت: بە تەمای لەبەری ئەم دارخورمایە بخۆیت؟
جوتیارە پیرەکە وەڵامی دایەوەو وتی: چاندیان و خواردمان دەچێنین و دەخۆن.
وەزیرەکە سەرسام بوو بە قسەکەی بۆیە دیاریەکی پێدا.
جوتیارەکە وتی: سەیر کە گەورەم ئەم دار خورمایە چەند زوو بەری گرت.
وەزیرەکە سەرسام بوو بە قسەکەی و دیاریەکی تری پێدا.
جوتیارەکە وتی: گەورەم دارخورماکە ئەم ساڵ دوو جار بەری گرت.
وەزیرەکە جارێکی تر سەرسام بوو بە قسەکەی، زەردەخەنەیکی کردو جوتیارەکەی جێهێشت.

* دەگێڕنەوە کە پاشایەکی فارس چێشت لێنەرەکەی خواردنی بۆ هێناو لێی نزیک کردەوە، دڵۆپێك لە چێشتەکەی ڕژا بەسەر پاشادا، پاشا تووڕە بوو فەرمانی کرد کە بیکوژن.
چێشت لێنەرەکە قاپێکی هەڵگرت و قلْپی کردەوە بەسەر پاشاو سفرەکەداو هەمووی ڕشت.
پاشا وتی: بۆ ئەوەت کرد کە دەزانی ڕژانی دڵۆپێك بەسەرمدا بەسە بۆ کوشتنت.
چێشت لێنەرەکە وەڵامی دایەوەو وتی: شەرمم کرد ئەی پاشا خەڵك ببیستن کە من چەند ساڵە خزمەتت دەکەم و ڕێزت دەگرم تەنها بەهۆی بە هەڵە ڕژانی دڵۆپێك بەسەرتدا فەرمانت کرد کە بمکوژن، ویستم تاوانەکەم گەورەتر بکەم و خەڵك لۆمەت نەکات و نەڵێن پاشا لەسەر ڕژانی دڵۆپێك بە هەڵە چێشت لێنەرەکەی کوشت.
پاشا کە ئەمەی بیست لێی خۆش بوو وە فەرمانی کرد کە خەڵاتێکی پێ بدەن.

* پیاوێکی دڵتەنگ پرسیاری لە دانایەك کرد: ئەی پیاوی دانا هاتوم بۆ لای تۆ بزانیت چارەی ئەم خەم و پەژارەیەی من چیە؟
داناکە وتی: دوو پرسیارت لێ دەکەم تۆ وەڵامم بدەرەوە.
پیاوەکە وتی: بپرسە.

داناکە وتی: کاتێك هاتیتە سەر دونیا ئەم خەم و پەژارەیەت هەبوو؟
پیاوەکە وتی: نەخێر.
داناکە وتی: کاتێك کە دونیا جێ دەهێڵیت ئەم خەمە لەگەڵ خۆتدا دەبەیت؟
پیاوەکە وتی نەخێر.
داناکە وتی: کارێك کە لەگەڵتدا نەهاتبێت و لەگەڵیشتدا نەڕوات بۆ خەمی بۆ دەخۆیت.. واز لەم بیرکردنەوانەت بێنەو ئارامگربە لە کارەکانی دونیاتدا، وە با ڕوانینت بۆ ئاسمان درێژترو زیاتر بێت لە ڕوانینت بۆ زەوی ئەوەی دەتەوێت بە دەستی دەهێنیت.

* دەگێڕنەوە کە یەکێك پرسیاری لە دانایەك کرد: باشە ئێمە لە کوێ بووین کاتێك ئەو سامان و کۆشك و ئۆتۆمبیلانە دابەش کران؟
داناکە وتی: لەگەڵم وەرە وەڵامەکەت پێ بڵێم، دەستی گرت و لەگەڵ خۆی بردی بۆ نەخۆشخانەو وتی: ئەی پیاو ئێمە لە کوێ بووین کاتێك ئەو نەخۆشی و نەشتەرگەرییانە دابەشکران؟
ئێمە لەکوێ بووین کە ئەم ئیفلیجی و ژێرپەنجەیە دابەش کران؟
پیاوەکە زۆر گریا وتی خوایە گیان پەنات پێ دەگرم و زۆر شوکرم بەوەی پێت بەخشیوم.

* پیاوێك ڕۆیشتە لای پزیشك و پێی وت سگم ئازاری زۆری هەیە.

پزیشکەکە وتی: چیت خواردووە؟
پیاوەکە وتی: کولێرەیەکی سوتاوم خواردووە.
پزیشکەکە داوای کلی کرد بۆ ئەوەی لە چاوی نەخۆشەکەی بکات.
نەخۆشەکە وتی: من ئازاری سکم هەیە نەك ئازاری چاو.
پزیشکەکە وتی: دەزانم بەڵام کلت لە چاو دەکەم بۆ ئەوەی چاوت بەهێز بێت و کاتێك شتێکی سوتاوت بینی نەیخۆیت.

* پرسیاریان لە دکتۆرەیەکی ئەوروپی باڵاپۆش کرد دەربارەی باڵاپۆشی کە ئایا نیشانەی دواکەوتن نییە؟
ئەویش زۆر بە سادەیی و زیرەکی وەڵامی پرسیارەکەی دانەوەو وتی: بێگومان مرۆڤ لەسەدەکانی یەکەم نیمچە ڕووت بوو، بەپێی ڕۆیشتنی کات و پێشکەوتنی بیرو فکری دەستی کرد بە پۆشینی جلوبەرگ وە ئەوەی من ئەمڕۆ لەسەریم و ئەو جلوبەرگەی دەیپۆشم لوتکەی پێشکەوتنە کە مرۆڤ پێی گەیشتووە، وە ڕووتی نیشانەی دواکەوتویی و گەڕانەوەیە بۆ سەدەکانی یەکەم، ئەگەر ڕووتی نیشانەی پێشکەوتن بێت ئەوا ئاژەڵەکان زۆر پێشکەوتوو ترن.

* کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب ویستی هورمزان بکوژێت، هورمزان داوای ئاوی کرد کاتێك ئاویان بۆ هێنا بەدەستەکانی گرتی و دەترساو دەستی دەلەرزی، عومەر وتی: تا ئاوەکە دەخۆیتەوە ترست لەسەر نییە.

هورمزان پەرداخەکەی بەردایەوەو ئاوەکەی نەخواردەوە، عومەر فەرمانی کوشتنی کرد، هورمزان وتی: ئایا نەتوت ژیانت مەترسی لەسەر نیە تا ئاوەکە نەخۆیتەوە خۆ ئاوەکەم نەخواردەوە.

عومەر خوا لێی ڕازی بێت وتی: خوا بتکوژێ ئەو دڵنیاییەت لە من وەرگرت بێ ئەوەی هەستی پێ بکەم، بڕۆ ئەوە ئازادم کردی.

* ڕەزیلێك بە خزمەتکارەکەی وت: ئەو خواردنە بێنەو دەرگاکەش داخە.

خزمەتکارەکەی وتی: گەورەم ئەوە هەڵەیە دەبێت بڵێی دەرگاکە داخە پاشان خواردنەکە بێنە.

* کۆمەڵێك کەس لە دەوری سفرە دانیشتبوون چەند ماسیەکی گەورەو بچوکیان برژاندبوو خەریك بوو دەست بە خواردنیان بکەن لەناکاو ئەشعەب لە دوورەوە بە دیارکەوت، یەکێکیان وتی: ئەوە ئەشعەبە خێرا ماسیە گەورەکان بشارنەوە تەنها بچوکەکان بهێڵنەوە تا دەڕوات ئەو کاتە بە ئیسراحەت دەیانخۆین، ئەشعەب لە دوورەوە بینی کە ماسیە گەورەکانیان شاردەوە، کاتێك هات یەکسەر لەسەر سفرە دانیشت، وتیان: ئەشعەب ڕات چۆنە دەربارەی خواردنەکە؟

وتی: بەخوا من زۆر ڕقم لە ماسیە لەبەرئەوەی باوکم لە دەریادا نقوم بوو ماسیەکان خواردیان.

وتیان: دەی مادام وایە ئەوە ماسیت لەبەردەمە تۆڵەی خۆتی لێ بکەوە.

ئەشعەب یەکێك لە ماسیە بچوکەکانی بەردەمی هەڵگرت و نزیکی کردەوە لە گوێی بە سیلەی چاویشی سەیری ئەو شوێنەی دەکرد کە ماسیە گەورەکانیان لێ دانا بوو پاشان وتی: دەزانن ئەو ماسیە دەڵێت چی؟
هەمووان بەیەکەوە وتیان: دەڵێت چی؟
وتی: دەڵێت من باوکتم نەخواردووە لەبەر ئەوەی من بچوکم ئەو کاتەی باوکت نقوم بوو لە دایك نەبوو بووم، بەڵام ماسیەکی گەورە لێرە دانراوە ئەو باوکتی خواردووە تۆڵەی خۆت لەو بکەوە ئەو بخۆ.

* نوێنەری دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ گەورەکانی دەوڵەتی ئینگلیز کۆبۆوە، یەکێك لە گەورەکانیان پێی وت: بۆچی ئێوە سورن لەسەر ئەوەی کە ئافرەتی مسوڵمان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی دواکەوتوو بێت بەوەی کە داپۆشراو بێت و پیاوان نەتوانن بیبینن؟
ئەویش وەڵامی دایەوەو وتی: لەبەرئەوەی ئافرەتان لە ڕۆژهەڵات حەز ناکەن کە جگە لە پیاوی خۆیان منداڵیان لە کەسی تر هەبێت.
هەمووان بێدەنگ بوون و سەرسام بوون بەو وەڵامە ژیرانەیە.

* حەجاج حەوت سەد قامچی لە پیاوێکدا، هەر قامچیەکی لێدەدا پیاوەکە دەیوت سوپاس بۆ خوا (الحمدلله).
ئەشعەب پێی گەیشت و پێی وت: دەزانیت بۆچی حەجاج حەوت سەد قامچی لێدایت؟

وتی: نەخێر.

ئەشعەب وتی: لەبەرئەوەی زۆر سوپاسی خوات کرد، خوا دەفەرموێت﴿لَإِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾. واتە: سوێند بێ بێگومان ئەگەر ئێوە سوپاسی (چاکەی) من بکەن بۆتان زیاد دەکەم.

* ڕۆژێکیان ڕەشید بە پەهلولکی وت: کێت خۆش دەوێت؟

پەهلول وتی: ئەوەی تێرم بکات.

ڕەشید وتی: من تێرت دەکەم خۆشت دەوێم؟

پەهلول وتی: خۆشەویستی بە دواخستن نابێت.

* کەشتیەك لەناو دەریا توشی چەند شەپۆلێکی گەورە بوو خەریك بوو نقوم ببێت، هەموو ئەوانەی لەسەر کەشتیەکە بوون زۆر ترسان تەنها پیاوێك نەبێت بەبێ دەنگی دانیشتبوو جوڵەی نەدەکرد، هەندێك پێیان وت: باشە تۆ ناترسیت؟

وتی: نەخێر من نوشتەیەکم بۆ خۆم نوسیوە کە لە نقوم بوون دەمپارێزێت.

هەموان ڕایان کردو وتیان بۆ ئێمەشی بنوسە.

وتی: هەر نوشتەیەك بە دوو دینار دەنوسم، ئەوەی ویستی نوشتەکەی بۆ نوسی و پارەکەی لێ وەرگرت.

دوای ئەوەی ڕزگاریان بوو یەکێك زانی کە ئەوە کەسێکی فێڵبازە لێی نزیك بوویەوەو پێی وت: ئایا نەدەترسایت بە درۆکەت بزانن و فێڵەکەت ئاشکرا ببێت؟

وتی: نەخێر ئەگەر کەشتیەکە نقوم ببوایە ئەوا هەموومان دەخنکاین، بەڵام ئەوە ڕزگارمان بوو وە فێڵەکەم سەری گرت.

* ئیبن جەوزی دەڵێت: پیاوێك هاتە لای ئەبو حازم پێی وت: شەیتان دێتە لام و دەڵێت تۆ خێزانەکەت تەڵاق داوە، گومانم بۆ دروست دەکات.

ئیبن جەوزی وتی: ئەی تەڵاقت نەداوە؟

پیاوەکە وتی: نەخێر.

ئیبن جەوزی وتی: ئەی دوێنێ نەهاتیتە لای من و لێرە تەڵاقت نەدا؟

پیاوەکە وتی: نەخێر سوێند بەخوا ئەمڕۆ نەبێت هەر نەهاتومە لای تۆ وە بە هیچ شێوەیەك تەڵاقم نەداوە.

ئیبن جەوزی وتی: دەی ئەگەر ئەم جارە شەیتان هاتە لات سوێندی بۆ بخۆ هەروەك چۆن سوێندت بۆ من خوارد ئەوا ڕزگارت دەبێت.

* لەبەرنامەیەکدا گەنجێك پرسیاری لە شێخێك کرد وتی: موبایلەکەم قورئانی تێدا خەزن کراوەو لەگەڵ خۆشم دەیبەم بۆ ئاودەست ئایا کێشەی هەیە؟

شێخەکە یەکسەر وەڵامی دایەوە وتی: نەخێر زۆر ئاساییە.

گەنجەکە وتی: ئاخر قورئانی تێدا خەزن کراوە.
شێخەکە وتی: کێشە نییە براکەم قورئانەکە لەناو میمۆریەکەدا خەزنە.
گەنجەکە وتی: ئاخر ئەو میمۆریەش لەناو مۆبایلەکەدایە.
شێخەکە وتی: تۆ هیچ قورئانت لەبەرە.
گەنجەکە وتی: بەڵێ زۆرم لەبەرە.
شێخەکە وتی: دەی قورئانەکە لەناو مێشکتدا خەزنە، ئەگەر وا بێ دەبێت مێشکت لەدەرەوە دانێیت تا لە ئاودەست دێیتە دەرەوە لەبەرئەوەی قورئانی تێدا خەزن کراوە.
گەنجەکە قسەی نەما یەکسەر تەلەفۆنەکەی داخستەوە.

* ڕۆژێکیان ئیمامی شەعبی وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: پارشێو بکەن ئەگەر بەوەش بێت کە پەنجە بخەیتە ناو گلێ و پاشان بیخەیتە ناو دەمتەوە.
یەکێک وتی: ئەی شێخ کام پەنجەیە؟
شەعبی پەنجە گەورەکەی قاچی گرت و وتی: ئەوەیان.

* کۆمەڵێک کەسی سەر بە هۆزێك هاتنە لای خەلیفە هیشامی کوڕی عبدالملك بۆ ئەوەی باسی هەژاری و نەبوونی و حاڵی خراپی خۆیانی بۆ بکەن، خەلیفە قەناعەتی بە قسەکانیان نەکرد، گەنجێك لە ناویاندا هەستاو وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران ئەگەر ئەو ماڵە هی خوایە ئەوە

دابەشی بکە بەسەر بەندەکانیدا وە ئەگەر هی خۆتە ئەوا خێری پێ بکە وە ئەگەر هی ئێمەشە ئەوا لێمانی مەگرەوە.
خەلیفە وتی: بەخوا بیانویەکت بۆ نەهێشتمەوە.

* عوسمانی کوڕی حەفص بەلای ئەبو نەواسدا ڕۆیشت کە نەخۆش بوو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو، عوسمان کەسێکی زۆر ناشیرین بوو بە ئەبو نەواسی وت: ئەوە چیتە بۆ وا ڕەنگت زەرد بووە.
ئەبو نەواس وتی: کاتێك تۆم بینی بیری تاوانەکانی خۆمم کەوتەوە.
عوسمان وتی: جا بۆ بە بینینی من بیری تاوانەکانت کەوتەوە؟
ئەبو نەواس وتی: ترسام کەخوا بەهۆی تاوانەکانمەوە سزام بدات و وەك تۆ بمکات بە مەیمون.

* بوحتوری شاعیر دەڵێت: ڕۆژێکی زستانی زۆر سارد لای خەلیفە موتەوەکیل بووین پیاوێکی لا بوو ناوی عوبادە بوو فەرمانی پێ کرد کە خۆی فڕێداتە ناو گۆمە ئاوێکی سارد ئەویش خۆی فڕێداو خەریك بوو لە سەرما بمرێت پاشان لە گۆمەکە هێنایانە دەرەوەو لە لایەکی مەجلیسەکە دانیشت، خەلیفە وتی: ئەی عوبادە حاڵت چییە؟
وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران لە قیامەت گەڕاومەوە.
خەلیفە وتی: حاڵی براکەم واثیق چۆن بوو؟
وتی: سەردانی دۆزەخم نەکرد.

خەلیفە زۆر پێکەنی و فەرمانی کرد خەڵات بکرێت.

* پیاوێك بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکردو دەیوت من موسای کوڕی عیمرانم، هەواڵەکەی گەیشتە لای خەلیفەو داوای کرد بیهێن، کاتێك هێنایانە لای خەلیفە پێی وت: تۆ کێیت؟

وتی: موسای کوڕی عیمران.

خەلیفە وتی: ئەوە ئەو گۆچانەیە کە بوو بە مار؟

پیاوەکە وتی: بەڵێ.

خەلیفە وتی: دەی گۆچانەکەت فڕێدە با ببێت بە مار هەر وەك چۆن موسا پێغەمبەر کردی.

پیاوەکە وتی: تۆ بڵێ من پەروەردیگاری هەرە بەرزو بڵندی ئێوەم هەروەك چۆن فیرعەون وتی هەتا منیش گۆچانەکە بکەم بە مار هەروەك چۆن موسا کردی.

* پیاوێکیان هێنایە لای خەلیفە مەئمون کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، مەئمون پێی وت: بەڵگەت چییە؟

پیاوەکە وتی: دەزانم چیت لەناو دڵدایە.

مەئمون وتی: چیم لەناو دڵدایە؟

پیاوەکە وتی: تۆ پێت وایە کە من درۆ دەکەم.

خەلیفە پێکەنی و ڕێگەی دا بڕوات.

* دەگێڕنەوە کە پیاوێك سواری وڵاخێك بوو بوو وە موحەمەدی کوڕی عەلی بە پێ لەگەڵی دەڕۆیشت، چەند کەسێك بینیان پێیان وت: چۆن تۆ سوار دەبیت و موحەمەدیش بەپێ بڕوات؟

وتی: ئەو فەرمانی ئەوەی پێ کردم، ئەگەر بە قسەی بکەم و سواربم باشترە لەوەی بەپێ بڕۆم و سەرپێچی بکەم.

* پیاوێك نیوەی شەو هاتە لای ئەبو حەنیفەو پێی وت: ئەی پێشەوا فریام کەوە پێش ئەوەی ڕۆژ ببێتەوە دەنا تەڵاقم دەکەون.

ئەبو حەنیفە وتی: بۆچی؟

پیاوەکە وتی: ئەم شەو لەگەڵ خێزانم لەیەك توڕە بووین و قسەی لەگەڵ نەدەکردم پێم وت: ئەگەر تا بەیانی قسەم لەگەڵ نەکەیت ئەوا سێ بە سێ تەڵاق دراویت دواتر زۆر داوام لێ کردو لێی پاڕامەوە کە قسەم لەگەڵ بکات کەچی ڕازی نەبوو.

ئەبو حەنیفە وتی: بڕۆ لای بانگبێژی مزگەوت و پێی بڵێ بانگ بدات پێش ئەوەی کاتی بەیانی دابێت، خێزانەکەت کاتێ گوێی لە بانگ بوو قسە دەکات.

پیاوەکە ئەمەی کردو ڕۆیشتەوەماڵەوە، کاتێك بانگبێژ بانگی دا خێزانەکەی پێی وت: ئەوە ڕۆژیش داهات و لە دەستت ڕزگارم بوو.

پیاوەکە وتی: سوپاس بۆ خوا قسەت لەگەڵ کردم پێش ئەوەی ڕۆژ ببێتەوەو لەو کێشەیە ڕزگارم بوو.

* دەشتەکیەك لە کوڕەکەی تورە بوو سەرزەنشتی کرد بە دایکی و پێی وت: سەرپێچیم دەکەیت و لوتت بەرز دەکەیت لە کاتێکدا تۆ کوڕی کارەکەرەیەکیت؟

کوڕەکەی وتی: بەخوا ئەو کارەکەرەیە باشترە بۆ من لە تۆ.

باوکی وتی: چۆن باشترە لە کاتێکدا ئەو کەسێکی کۆیلەیەو من کەسێکی ئازادم؟

کوڕەکە وتی: لەبەرئەوەی ئەو لە پیاوێکی ئازاد منی هێنایە سەر دونیا بەڵام تۆ لە ئافرەتێکی کۆیلە منت هێنایە سەر دونیا.

* کۆمەڵێك پیاو لە کوفەوە هاتنە لای عومەری کوڕی خەتتاب و سکاڵایان لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص کرد.

عومەر وتی: خەڵکی کوفە ئەگەر پیاوێکی لەخوا ترسم کردە فەرمانڕەوا بەسەریاندا ئەوا بە لاوازی دادەنێن وە ئەگەر یەکێکی بەهێزم کردە فەرمانڕەوا بەسەریاندا ئەوا بە خراپەکاری دادەنێن.

موغەیرە پێی وت: ئەی پێشەوای باوەڕداران کەسی لەخوا ترسی لاواز تەقوایەکەی بۆ خۆیەتی و لاوازیەکەی لەسەر تۆیە، وە کەسی بەهێزی خراپەکار خراپییەکەی بۆ خۆیەتی و بەهێزیەکەی بۆ تۆیە.

عومەر وتی: ڕاست دەکەیت، موغەیرەی کردە فەرمانڕەوایان لەسەردەمی عومەرو عوسمان و موعاویەش هەر فەرمانڕەوایان بوو هەتا مرد.

* دەگێڕنەوە کە گۆرانی بێژێکی ئافرەت هاتە لای سوڵتان مەلیك شا گۆرانیەکەی زۆر پێ خۆش بوو وە زۆر پێی سەرسام بوو پاشان چووە ناو دڵیەوەو نیازی (تێکەڵی ژن و مێردی) کرد.

ئافرەتەکە وتی: ئەی سوڵتان من بە پەرۆشم بۆ ئەو دەم و چاوە جوان و شۆخ و شەنگەت کە بە ئاگر سزا بدرێت، وە حەڵاڵ ئاسانترە وە لەنێوان حەڵاڵ و حەرامدا یەك وشە هەیە.

سوڵتان وتی: ڕاست دەکەیت، بانگی قازی کرد بۆ ئەوەی لەیەکیان مارە بکات، لەیەکی مارە کردن و هەتا مرد هەر لای بوو.

* کاتێك ئەبو نەواس نەخۆش بوو جەماز هاتە لای و پێی وت: ئەی ئەبو نەواس لە خوا بترسە داوێن پیسیت لەگەڵ چەندەها ئافرەتی داوێن پیس کردووە وە چەندەها تاوانی ترت کردووە تۆ ئێستا لەو بارودۆخە دایت تەوبە بکە پێش ئەوەی بمریت.

ئەبو نەواس وتی: ڕاست دەکەیت بەڵام نایکەم.

جەماز وتی: بۆچی؟

ئەبو نەواس وتی: لەبەرئەوەی دەترسم تەوبەم لەسەر دەستی یەکێکی وەك تۆ بێت.

* کاتێك پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لەگەڵ ئەبوبەکر لە مەکەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە کافرەکانی قورەیش دوایان کەوتن و سەد وشتریان کردە خەڵات بۆ ئەو کەسەی بتوانێت سەری پێغەمبەریان(صلى الله علیه وسلم) بۆ بێنێت.

کاتێك لە رێگادا بوون بەرەو مەدینە کافرێکی قورەیش کە بە دوای پێغەمبەردا دەگەڕا هاتە لایان ئەو کافرە پێغەمبەری نەدەناسی وە نەیدەزانی کە لەگەڵ ئەبوبەکر بەیەکەوە بەڕێکەوتوون بەرەو مەدینە بە ئەبوبەکری وت: ئەو پیاوە کێیە لەگەڵتە؟

ئەبوبەکر نەیویست درۆ بکات بۆ ئەوەی نەڵێن هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) درۆزنن وتی: ئەوە ڕێ نیشاندەرمە، ئەبوبەکر مەبەستی ئەوە بوو کە ڕێگای ڕاستی ئیسلامم نیشان دەدات پیاوەکەش وای زانی مەبەستی ئەوەیە کە ڕێگای مەدینەی نیشان دەدات.

* خەلیفەیەك ماوەیەك هاوڕێیەکی دیار نەما پرسیاری کرد دەربارەی وتیان: نەخۆشە،پاش ماوەیەکی تر پرسیاری کردەوە دەربارەی وتیان: مرد.

خەلیفە پرسیاری دەربارەی هۆکاری نەخۆشیەکەی کرد وتیان: توشی خۆشەویستی کەنیزەکێك بوو بەو هۆیەوە نەخۆش کەوت پاشان مرد..

خەلیفە ویستی ئەو کەنیزە ببینێت بۆیە داوای کرد بیهێنن، کاتێك هێنایان

بینی چاوێکی کوێرە خەلیفە پێی وت: ئەوە بە کام چاوە سەیری کردووی وا لە خۆشەویستیت مردووە؟

وتی: بەو چاوەی کە خەڵك تۆیان پێ بینیوەو کردویانیت بە خەلیفە بەسەر خۆیاندا.

خەلیفە سەرسام بوو بە وەڵامەکەی وتی: حەقی بووە بمرێت، دیارە سەرسام بووە بە زمانپاراویەکەی.

* مامۆستایەکی هونەر لەگەڵ قوتابیەکانی لە پێشەنگایەکی وێنەدا دەسوڕانەوە بە قوتابیەکانی وت: با وا دابنێین لەناکاو ئەم هۆڵە ئاگری گرت هەلێکتان بۆ ڕێك کەوت کە پێنج تابلۆ لەو تابلۆیانەی نمایش کراون بۆ خۆتان ڕزگار بکەن، کام وێنەیە هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی ڕزگاری بکەن؟
یەکێك لە قوتابیەکان یەکسەر وەڵامی دایەوەو وتی: کامەیان لە دەرگاکە نزیکتر بوو.

* ئەصمەعی دەڵێت فەرمانڕەوایەك پیاوێکی دەشتەکی ڕاسپارد بۆ ئەوەی کارێك بکات، دەشتەکیەکە خیانەتی لە کارەکەدا کرد فەرمانڕەواش لە ئیشەکە دووری خستەوەو داوای کرد بیهێننە لای، کاتێك هێنایان پێی وت: ئەی دوژمنی خوا پارەو ماڵی خوا دەخۆیت؟
دەشتەکیەکە وتی: ئەی پارەی کێ بخۆم ئەگەر پارەو ماڵی خوا نەخۆم.. زۆر دەورەی شەیتانم دا فلوسێکم بداتێ نەیدامێ.

فەرمانڕەواکە پێکەنی و ڕێگەی دا بڕوات.

* یەکێك پرسیاری لە شێخ محمد غەزالی کرد وتی: ئەی شێخ حوکمی کەسی نوێژنەکەر چییە؟
وەڵامی دایەوەو وتی: حوکمی ئەوەیە کە دەستی بگریت و لەگەڵ خۆت بیهێنی بۆ مزگەوت، بانگخواز بە نەك قازی.

* خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنصور پرسیاری لە پیاوێك کرد کە شەڕی دژی سوپاکەی کردبوو: پێم بڵێ کام سەربازەم لە هەموان ئازاتر بوو وە خێراتر بەرەو ڕوتان هەنگاوی هەڵدەگرت؟
پیاوەکە وتی: دەموچاویان ناناسم بەڵام پشتەوەیان دەناسمەوە، پێیان بڵێ پشتم تێکەن بۆ ئەوەی پێت بڵێم کامەیان.

* (ابن سلام) دەڵێت: فەرەزدەقی شاعیر بە لاماندا تێپەڕی بە عەنبەسەی وت: ئەرێ کەی دەچیتە قیامەت؟
عەنبەسە وتی: ئیشت چیە لەوێ؟
فەرەزدەق وتی: نامەیەکم هەیە دەمەوێت بۆ باوکمی بنێرم.
عەنبەسە وەڵامی دایەوە:ڕێگەم بە دۆزەخدا نییە، بەدوای یەکێکدا بگەڕێ بچێتە دۆزەخ.

* دەشتەکیەك لەبەردەم مەئمون دا وەستا کە تاوانێکی کردبوو، مەئمون وتی: سوێند بەخوا دەتکوژم ئەی دەشتەکی لە سزای ئەو تاوانەی کە کردووتە.

دەشتەکیەکە وتی: بمبورە ئەی پێشەوای باوەڕداران.

مەئمون وتی: ئەگەر لێت ببورم چۆن بە خوا بگەم.

دەشتەکیەکە وەڵامی دایەوە: بەخوا ئەگەر بە تاوانباری بەخوا بگەی باشترە لەوەی کە بە خوێنرێژی پێی بگەی.

* ئیمام صالح کوڕی موحەمەد دەڵێت: چوومە ناو میسر بینیم ئاڵقەیەکی گەورە بەستراوە وتم: ئەوە کێیە؟

وتیان: ئەوە مامۆستای نەحوە، لێی نزیك بوومەوە گوێم لێ بوو دەیوت: ئەوەی پیتی صاد بێت دەتوانیت بە سین دەری ببڕیت منیش چوومە لایان و وتم: الصلام عليكم يا أبا سالح أسليتم؟ ڕاستەکەی (السلام عليكم يا أبا صالح أصليتم)؟

پێی وتم: بێ شەرم ئەوە چ قسە کردنێکە؟

وتم: ئەوە قسەی خۆتە ئێستا وتت ئەوەی پیتی صاد بێت دەتوانیت بە سین دەری ببڕیت.

* ئەشعەب دەڵێت کەنیزەکێك دینارێکی هێنایە لام وتی: ئەم دینارەم بۆ هەڵگرە منیش لێم وەرگرت و خستمە ناو نوێنەکانەوە، دوای چەند ڕۆژێك

داوای دینارەکەی کردەوە وتم: دینارەکەت منداڵێکی بووە درهەمێکم لەوێ دانا بوو وتم ئەوە منداڵەکەیەتی هەڵی بگرە ئەویش درهەمەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت، دوای چەند ڕۆژێکی تر گەڕایەوەو داوای دینارەکەی کردەوە وتم: دینارەکەت منداڵێکی تریشی بووە ئەم جارەش درهەمێکی هەڵگرت و ڕۆیشت جاری سێیەمیش ئەمە دووبارە بوویەوە، جاری چوارەم گەڕایەوە کاتێك بینینم دەستم کرد بە گریان، وتی: ئەوە بۆچی دەگریت؟

وتم: دینارەکەت مرد بەهۆی زەیستان (خوێنی دوای منداڵ بوون).

وتی: چۆن دینار زەیستانی هەیە؟

وتم: ئەی گەمژە چۆن باوەڕ دەکەیت کە منداڵی دەبێت بەڵام باوەڕ ناکەیت کە زەیستانی هەیە.

* زوبەیری کوڕی بەکار دەڵێت: ئافرەتێك هاتە لای ئیبن زوبەیر شکاتی لە هاوسەرەکەی کرد بەوەی لەگەڵ کارەکەرەکەی دەستی تێکەڵ کردووە، ئەویش فەرمانی کرد بیهێنن، کاتێك هێنایان پرسیاری لێ کرد: چی دەڵێیت دەربارەی ئەوەی خێزانەکەت دەیڵێت.

پیاوەکە وتی: خێزانەکەم ڕەشە و کارەکەرەکەشی هەر ڕەشە منیش چاوم کز بووە بەتایبەت شەوانە تارماییان دێتە سەرو لێکیان جیا ناکەمەوە بۆیە ئەوەی لێم نزیك ببێتەوە حیسابی خێزانمی بۆ دەکەم.

* فەرمانڕەوایەکی کوفە خێزانەکەی کچێکی بوو زۆر پێی ناخۆش بوو لەبەرئەوەی حەزی لە کوڕ بوو بۆیە وازی لە خواردن هێنا، پەهلول کە شێتێکی ئەو سەردەمەیە هاتە لای و پێی وت: ئەم خەم و خەفەتەت لە چیە.. دڵتەنگیت بە منداڵێکی ساغ کە پەروەردیگار پێی بەخشیویت.. ئایا حەزت دەکرد لە جێگەی ئەو منداڵێکی وەك منت بوایە؟
فەرمانڕەواکە کاتێك گوێی لەمە بوو پێکەنی و خەم و پەژارەی نەما.

* کاتێك (حاطب بن أبي بلتعة) نامەی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بۆ فەرمانڕەوای ڕۆمەکان لە میسڕ برد فەرمانڕەواکە وتی: ئەگەر موحەمەد پێغەمبەرە چی ڕێگری لێ دەکات کە نزا بکات لەوانەی دژایەتی دەکەن و لە شارەکەی دەری دەکەن؟
حاطب وتی: ئەی چی ڕێگری لە عیسا پێغەمبەر کرد (سەلامی خوای لێ بێت) کاتێك یەهودیەکان گرتیان کە لە سێدارەی بدەن نزایان لێ بکات و لەناویان بەرێت؟!

* پیاوێکی پیر ڕۆیشتە لای سوڵتان سلێمانی قانونی و سکاڵای لە سەربازەکانی کرد کە مەڕوماڵاتەکەیان دزیبوو کاتێك خەوی لێ کەوتبوو.
سوڵتان پێی وت: پێویست بوو لەسەرت چاودێری مەڕوماڵاتەکەت بکەیت نەوەك بخەویت.

پیاوەکە وەڵامی دایەوە: گەورەم وامزانی تۆ بە ئاگایت بۆیە بە هێمنی خەوتم.

* سواڵکەرێك لە دەرگایماڵێکی داو داوای یارمەتی لێ کردن پێیان وت: خوا ڕزقت بدات.

وتی: پارچە نانێك.

وتیان: نیمانە.

وتی: کەمێك گەنم یان جۆ یان پاقلە.

وتیان: نیمانە.

وتی: کەمێك ڕۆن یان شیر یان کەرە.

وتیان نیمانە.

وتی: دەی باشە پەرداخە ئاوێکم بۆ بێنن.

وتیان: ئاویشمان نییە.

وتی: ئەی بۆ لێرە دانیشتوون هەستن سواڵ بکەن ئێوە لە من شایستە ترن.

* دەشتەکیەك لەبەردەم فەرمانڕەوایەك وەستا بوو بۆ ئەوەی لەسەر تاوانێك دادگایی بکرێت کە پێی تۆمەتبار کرا بوو، لەناکاو کاغەزێکی دەرهێنا کە کێشەکەی تێدا نوسرا بوو بۆ فەرمانڕەوای ڕاگرت بۆ ئەوەی

لێی وەربگرێت و وتی: (هاكم اقرأوا كتابية) ها نامەکەم بگرن و بیخوێننەوە.

فەرمانڕەوا پێی وت: ئەمە ڕۆژی دوایی دەوترێت.

دەشتەکیەکە وتی: ئەمڕۆ لە ڕۆژی دوایی خراپترە، لەبەرئەوەی ڕۆژی دوایی خراپەکانم و چاکەکانیشم دێنن، بەڵام ئێوە ئەمڕۆ تەنها خراپەکانی منتان هێناوەو وازتان لە چاکەکانم هێناوە.

فەرمانڕەوا پێکەنی و لێی خۆش بوو.

* دەشتەکیەك هاتە لای پاشایەك و مەدح و ستایشی دەکردو نزای بۆ دەکرد لەو بارودۆخەدا بوو لەناکاو دەنگێکی لێوە هات و هەموو ئەوانەی لەوێ بوون گوێیان لێ بوو، دەشتەکیەکە هیچ خۆی تێك نەداو شەرمی نەکرد بەڵکو ئاوڕی دایەوە بۆ دواوەی خۆی و سەیری سمتەکانی خۆی دەکردو پێی دەوتن: ئەم پاشا گەورەیە شایستەی ئەوەیە بە هەموو ئەندامەکان سوپاس و ستایشی بکرێت بەڵام ئەگەر بینیت زمان قسە دەکات تۆ بێدەنگ بە.

پاشا زۆر پێی پێکەنی و داواکاریەکەی بۆ جێبەجێ کرد.

* پیاوێك لە نزیك جوحا دانیشتبوو لە ناکاو دەنگێکی لێوە هات زۆر شەرمی کرد، دارێکی هەڵگرت و خشەخشی پێ دەکرد بۆ ئەوەی وا نیشان

بدات كه ده‌نگه‌كه هی ئه‌و داره بوو، جوحا پێی وت: باشه ئه‌وه گریمان ده‌نگه‌كه‌شت شارده‌وه ئه‌ی چی له بۆنه‌كه‌ی ده‌كه‌یت؟

* رۆژێكیان ئیبن سه‌ماك قسه‌ی ده‌كردو خزمه‌تكارێكی گوێی بۆ گرتبوو، كاتێك له قسه كردن ته‌واو بوو به خزمه‌تكاره‌كه‌ی وت: پێت چۆن بوو؟

خزمه‌تكاره‌كه وتی: زۆر جوان چاك بوو به‌ڵام قسه‌كانت زۆر دووباره ده‌كرده‌وه.

ئیبن سه‌ماك وتی: بۆیه دووباره‌م ده‌كرده‌وه هه‌تا ئه‌وه‌ی باش تێی نه‌گه‌یشتووه تێی بگات.

خزمه‌تكاره‌كه وتی: ئاخر هه‌تا ئه‌وه تێیده‌گات كه باش تێی نه‌گه‌یشتووه ئه‌وه بێزار ده‌بێت كه تێی گه‌یشتووه.

* له‌سه‌رده‌می خه‌لیفه مه‌ئموندا پیاوێك داوای پێغه‌مبه‌رایه‌تی ده‌كرد كاتێك هێنایانه لای خه‌لیفه پێی وت: موعجیزه‌ت چییه؟

پیاوه‌كه وتی: چیت ده‌وێت داوا بكه.

خه‌لیفه قفڵێكی لا بوو وتی: ها ئه‌و قفڵه بكه‌ره‌وه.

پیاوه‌كه وتی: من وتم پێغه‌مبه‌رم نه‌موتووه ئاسنگه‌رم.

خه‌لیفه پێكه‌نی و رێگه‌ی دا بڕوات.

* گۆزەکەرێك زۆر لێهاتوو بوو لە دروستکردنی گۆزەدا خەلیفە حەزی لێ بوو سەیری بکات و ببینێت کە چۆن کار دەکات بۆیە بانگهێشتی کردە کۆشکەکەی ئەویش هات و هەموو ئەو کەلوپەلانەی کە پێویستی بوون بۆ دروستکردنی گۆزە لەگەڵ خۆی هێنانی، کاتێك خەریك بوو دەست بە کارەکەی بکات خەلیفە هاتە لای و ئەویش لەبەری هەستا خەلیفە پێی وت: دانیشەو بەردەوام بە لە کارەکەت من بۆ ئەوە نەهاتوم لەبەرم هەستیت، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووم کە ببینم چۆن کار دەکەیت.
گۆزەکەرەکە وتی: وە من بۆ ئەوە نەهاتووم کە ڕەوشتم خراپ بکەم بەڵکو بۆ ئەوە هاتووم کە ڕەوشتم زیاد بکات لەلات.
خەلیفە سەرسام بوو بە وەڵامەکەی.

* شاعیرێك وتی: من ئەگەر لە کۆتایی هەموو شاعیرەکانیشەوە هاتبم شیعری وا دەنوسم کە هەرگیز شاعیرانی پێش خۆم نەیانتوانی بێت شیعری وا بنوسن.
یەکێك وتی: ئەگەر ڕاست دەکەیت بەو پیتانە مەنوسە کە ئەوان پێیان نوسیوە.

* لەسەردەمی موعتەصیمدا پیاوێك داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد هێنایانە لای خەلیفەو پێی وت: تۆ پێغەمبەریت؟
پیاوەکە وتی: بەڵێ.

خەلیفە وتی: بۆ سەر كێ ڕەوانە كراویت؟

پیاوەكە وتی: بۆ سەر ئێوە.

خەلیفە وتی: من شایەدی دەدەم كە تۆ كەسێكی گێل و گەمژەیت.

پیاوەكە وتی: بۆ هەر گەلێك یەكێكی وەك خۆیان دەنێردێت.

خەلیفە پێكەنی و فەرمانی كرد شتێكی پێ بدەن.

* یەكێك بە پیاوێكی وت: تۆ خەڵكی شارێكی سوك و ڕیسوایت.

ئەویش وەڵامی دایەوەو پێی وت: من بەهۆی شارەكەمەوە عەیبدار دەكرێم، بەڵام تۆ خۆت مایەی عەیبداری بۆ شارەكەت.

* حەجاج بە پیاوێكی وت: من درێژترم یان تۆ؟

پیاوەكە وتی: تۆ عەقڵت درێژترەو منیش باڵام.

* موتەوەكیل بە ئەبو عەینائی وت: سەعیدی كوڕی عبدالملك پێت پێدەكەنێت.

ئەبو عەیناء وتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُوا مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ﴾ المتطففین:۲۹.

واتە: بێگومان ئەوانەی تاوانیان دەكرد گاڵتەیان بە ئیمانداران دەهات و پێیان پێدەكەنین.

* خەلیفە ڕەشید بە ئیسماعیلی نوسەری وت: حەز دەکەم وەك تۆ خەتم خۆش بوایە.
ئیسماعیل وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران ئەگەر خەت خۆشی پایەبەرزی بوایە ئەوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە هەموو کەس خەتی خۆشتر دەبوو.

* ئەبو جەعفەری مەنصور بانگی ئەبو حەنیفەی کرد بۆ ئەوەی ببێتە قازی بەڵام ئەبو حەنیفە ڕازی نەبوو ئەویش زیندانی کرد، پاشان بانگی کردەوەو پێی وت: ئایا ڕازیت لەوەی کە ئێمە تێیداین؟
ئەبو حەنیفە وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران من گونجاو نیم بۆ دادوەری.
خەلیفە وتی: درۆت کرد.
ئەبو حەنیفە وتی: پێشەوای باوەڕداران حوکمی دا کە من گونجاو نیم بۆ دادوەری لەبەرئەوەی بە درۆزنی دانام، ئەگەر من درۆزن بم ئەوا گونجاو نیم بۆ دادوەری وە ئەگەر ڕاستگۆ بم من ڕاست دەڵێم کە گونجاو نیم بۆ دادوەری.

* حەجاج بە سەعیدی کوڕی جوبەیری وت: کام کوشتنەت پێ خۆشە بۆ خۆتی هەڵبژێرە.
سەعید وتی: تۆ بۆ خۆتی هەڵبژێرە لەبەرئەوەی تۆڵە لێکردنەوەت لەپێشە.

* عەلی کوڕی جەعد کەنیزەکێکی بە سێ دینار کڕی ابن قادم پێی وت: چی لەو کەنیزەکە دەکەیت؟

عەلی وتی: ئەگەر ئەوە شتێك بوایە لەسەر براکان تاقی کرابایەوە ئەوا لەسەرم تاقی دەکردیەوە.

* گەنجێك لە بەنی هاشم هاتە لای خەلیفە مەنصور، خەلیفە پرسیاری لێ کرد دەربارەی مردنی باوکی، گەنجەکە وتی: باوکم خوا لێی ڕازی بێت لە فڵان ڕۆژەدا نەخۆش کەوت، وە لە فڵان ڕۆژەدا مرد خوا ڕەحمی پێ بکات، وە ئەوەندە ماڵ و سامانەی لە دوای خۆیدا بەجێهێت خوا لێی خۆش بێت وە ئەوەندە منداڵەی لەدوای خۆیدا بەجێهێشت ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

ڕەبیعی کوڕی یوسف ( کە بە منداڵی دۆزرابوویەوە) لێی تورە بوو وتی: لەبەردەم پێشەوای باوەڕداران ئەوەندە نزا بۆ باوکت مەکە.

گەنجەکە وتی: لۆمەت ناکەم لەبەرئەوەی باوکت نازی هەڵنەگرتوی و تامی باوکایەتیت نەچەشتووە.

مەنصور ئەوەندە پێکەنی کە پێشتر نەیانبینی بوو ئەوەندە پێبکەنێت.

* پیاوێك ویستی کەنیزەکێك بفرۆشێت پێیان وت: قاچەکانی باریکن.

وتی: بۆ دەتانەوێت ژورێك لەسەر سەری دروست بکەن؟

* پیاوێك لەسەردەمی خەلیفە مەهدی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد هێنایانە لای مەهدی و پێی وت: تۆ پێغەمبەریت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: بۆ لای کێ ڕەوانە کراویت؟

پیاوەکە وتی: بۆ ئێوە هێشتتان بچمە لای ئەوانەی کە بۆیان ڕەوانە کرابووم، نیوەڕۆ ڕەوانە کرام و ئێوارە زیندانیتان کردم.

مەهدی زۆر پێکەنی خەڵاتێکی کردو ڕێگەی دا بڕوات.

* بە عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان وترا: پەلە مەکە پەلە کردن لە شەیتانەوەیە.

عەبدوڵڵا وتی: ئەگەر بەم شێوەیە بوایە موسا نەیدەوت: ﴿ وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَى﴾ طه:٨٤.

واتە: بۆیە بەپەلە هاتم بۆ لات ئەی پەروەردیگارم بۆ ئەوەی لێم ڕازی بیت.

* جارێکیان پیاوێکیان هێنایە لای فەرمانڕەوای شار کە کوندەیەکی بەتاڵی پێ بوو فەرمانی کرد لێی بدرێت پیاوەکە وتی: بۆچی لێم بدرێت؟

فەرمانڕەواکە وتی: لەبەرئەوەی ئامرازێکی شەرابت (مەی) پێیە.

پیاوەکە وتی: ئەگەر وا بێت تۆش ئامرازێکی زینات پێیە.

* ئەبو هیندی داوای کچی پیاوێکی هۆزی تەمیمی کرد، پیاوەکە پێی وت: ئەگەر وەکو باوکتِ بوای ئەوا کچەکەم پیّ دەدایت.
ئەبو هیندی وتی: ئەگەر وەکو باوکم بوام داوای کچی تۆم نەدەکرد.

* فەرمانڕەوایەك شمشێری بەسەر سەربازەکانیدا دابەش دەکرد، شمشێرێکی کۆن و خراپی دا بە سەربازێك و پێی وت: ها ئەم شمشێرە فەرمان پێکراوە.
سەربازەکە وتی: فەرمانی پیّ کراوە کە هیچ شتێك نەبڕێت.
فەرمانڕەواکە شمشێرەکەی بۆ گۆڕی و بە زیادەوەش شتی پێدا.

* ئافرەتێکی خەواریجیان هێنایە لای حەجاج، حەجاج بە وانەی وت کە لە دەورەی بوون: ڕاتان چییە؟
وتیان بیکوژە.
ئافرەتەکە وتی: هاوەڵانی براکەت باشتر بوون لە تۆو لە هاوەڵانی تۆ.
حەجاج وتی: براکەم کێیە؟
ئافرەتەکە وتی: فیرعەون، کاتێك ڕاوێژی بە هاوەڵەکانی کرد دەربارەی موسا وتیان:﴿ قَالُوا أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ ﴾ الأعراف:١١١

واتە: جاریَ وازی لیَ بێنە لەگەڵ براکەیداو چەند پیاوێك بنێرە لە شارەکاندا هەموو جادوگەرەکان کۆ بکەنەوە.

* فەرمانڕەوای ئەندەلوس نامەیەکی بۆ فەرمانڕەوای میسڕ نارد کە جنێوی بە خۆی و بە باوکی دا، ئەویش وەڵامی دایەوەو بۆی نوسی: ئێمەت ناسی جنێوت پێداین، ئەگەر ئێمەش تۆمان ناسیبا وەڵاممان دەدایەوە.

* پیاوێکی دەشتەکی لە مەجلیسێك دانیشتبو لەناکاو دەنگێکی لێوە هات هەندێك منداڵ و گەنج کە لەویَ بوون پێکەنین، پیاوەکە وتی: گەنجینە ئایا گوێتان لە شتێك بوو کە لە شوێنی خۆیدا نەبێت؟

* دەڵێن ڕێوی سەرزەنشتی دێڵە شێرێکی کرد بەوەی کە لە تەمەنیدا تەنها یەك بەچکەی بووە، ئەویش وەڵامی دایەوەو وتی: ڕاستە بەڵام شێر بوو.

* کاتێك ڕەشید تەوافی دەکرد پیاوێك پێی وت: ئەی پێشەوای باوەڕداران دەمەوێت قسەیەکی ڕەقت پیَ بڵێم لێم قبوڵ بکە.
ڕەشید وتی: خوا کەسێکی لە تۆ باشتری نارد بۆ لای کەسێکی لە من خرابترو پێی وت:﴿ فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَيِّنًا لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى ﴾ طه:٤٤.

واتە: جا قسە لەگەڵ (فیرعەون) بکەن بە نەرمونیانی بەڵکو بیر بکاتەوە یان بترسێ ( لە سزای خوا ).

* پیاوێك بە موعاویەی وت: بەخوا بەیعەتم پێدای هەرچەندە زۆریش پێم ناخۆشە.

موعاویە وتی: خوا خێرێکی زۆر بخاتە ئەو پێ ناخۆش بوونەت.

* شەوێکیان ڕەشید بانگی ئەبو یوسفی کردو دەربارەی بابەتێك پرسیاری لێ کرد ئەویش وەڵامی دایەوە، ڕەشید فەرمانی کرد سەد هەزار درهەمی پێ بدەن، وتیان: خەزنەدار لە ماڵەکەی خۆیەتی و دەرگاکانیش داخراون. ئەبو یوسف وتی: منیش لە ماڵەوە بووم و دەرگاکانیش داخرا بوون کاتێك بانگی کردم کرانەوە.

* بە فەیلەسوفێکیان وت: بۆچی ژن ناهێنیت بۆ ئەوەی منداڵت هەبێت؟ وتی:لەبەر خۆشەویستیم بۆ منداڵ، بەخوا من بۆ خۆم حەزم لە دونیا نیە تا بۆ ئەو حەزم لێی بێت.

* صالحی کوڕی عەلی لە عەبدولمەلیکی کوڕی تورە بوو پێی وت: ئەی کوڕی سۆزانی.

عەبدولمەلیك وتی: ﴿الزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ﴾النور:٣.

واتە: وە ئافرەتی (سۆزانی) زیناکەر مارەی ناکات پیاوی زیناکەر یان پیاوی موشریك نەبێت.

* عەمری کوڕی عاص بە موعاویەی وت: ئای چەند ماڵ و سامانت خۆش دەوێت.
موعاویە وتی: بۆ خۆشم نەوێت کەسی وەك تۆی پێ دەکەم بە کۆیلە.

* پیاوێك بە نابینایەکی وت: تاکەی چاوت ناکەیتەوە؟
وتی: چاوم بکەمەوە تا کێی پێ ببینم؟!

* پیاوێك بە شەریکی وت: پێم بڵێ کاتێك پێشەوا عەلی بە حەسەنی کوڕی وت: خۆزگە باوکت بیست ساڵ پێش ئێستا دەمرد، ئایا گومانی لە فەرمانڕەوایەتیەکەی خۆی هەبوو بۆیە ئەمەی وت؟
شەریك پێی وت: پێم بڵێ ئایا مەریەمی دایکی عیسا پێغەمبەر سەلامی خوایان لێ بێت گومانی لە داوێن پاکی خۆی هەبوو کاتێك وتی: ﴿ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾ مریم: ٢٣.
واتە: ئای خۆزگە پێش ئەو (ڕوداو)ە بمردمایە، وە من شتێکی لەبیر چووەی باسنەکراو بومایە.
پیاوەکە بێدەنگ بوو هیچ قسەیەکی تری نەکرد.

* جارێکیان ئەشعەب نوێژی زۆر کورت کردەوە پێیان وت: نوێژەکەت زۆر کورت کردەوە.
وتی: لەبەر ئەوەی ڕیای تێدا نەبوو.

* دەشتەکیەك داوای یارمەتی لە خەلیفە عبدالملك کرد ئەویش پێی وت: داوا لە خوا بکە.
دەشتەکیەکە وتی: داوام لێ کرد حەواڵەی لای تۆی کردم.
خەلیفە پێکەنی و یارمەتی دا.

* یەکێك سەرزەنشتی سوقراتی کرد بە شارەکەی، سوقرات پێی وت: ڕەچەڵەکی من لە منەوە دەستی پێ کرد بەڵام ڕەچەڵەکی تۆ لە تۆ کۆتایی پێهات.

* بە عوبادەیان وت: خوشکەکەت چی لە مێردەکەیەوە بۆ بەجێ ماوە ؟
وتی: چوار کچ و چوار مانگ و دە ڕۆژ.

* ئافرەتێك پێنج مێردی کرد هەموویان مردن کاتێك مێردی شەشەمی کرد ئەویش نەخۆش کەوت، ئافرەتەکە لەلای سەری مێردەکەی دانیشتبوو دەگریاو دەیوت: لای کێ جێم دەهێڵیت؟
پیاوەکە وتی: لای مێردە چارەڕەش و بەدبەختەکەی حەوتەمت.

* پاشایەکی فارس لەسەر دەرگای کۆشکەکەی نوسی بوو: دەرگای پاشاکان پێویستی بە زێری و سامان و ئارام گرتن هەیە.
دانایەك لە ژێرەوە نوسی: ئەوەی یەکێ لەم سێیانەی هەبێت پێویستی بەوە نییە بێتە بەر دەرگای پاشاکان.
ئەم هەواڵە بە پاشا گەیشتەوە فەرمانی کرد داناکە خەڵات بکرێت و نوسراوەکەش لەسەر دەرگاکە ڕەش بکرێتەوە.

* ئافرەتێك لەگەڵ مێردەکەی بوو بە مشتومڕیان لەسەر ئەوەی کە مەسروفی ماڵەوە ناکات و هیچ خواردەمەنیەکیان لە ماڵدا نییەو وتی: سوێند بەخوا مشکەکان لە ماڵەکەتدا نامێننەوە لەبەر خۆشەویستیان بۆ نیشتیمان نەبێت دەنا هەر لە ماڵی دراوسێکان خواردن دەخۆن.

* فەرمانڕەوایەك ماوەیەکی زۆر موچەی نەدا بەسەربازەکانی، یەکێ لە سەربازەکانی وتی: تۆ پێویستە سەربازی بەردت هەبێت نە بخوات و نە بخواتەوە.
فەرمانڕەواکە وتی: بێدەنگ بە ئەی سەگ.
سەربازەکە وتی: من سەربازی تۆم ئەگەر من سەگ بم ئەوا تۆ سەرکردەی سەگەکانی.

* کەنیزەکێکیان هێنایە لای موتەوەکیل و پێی: تۆ هەر کچیت یان چی؟
وتی: یان چی.

* مەنصور بە سەرکردەکانی سوپای وت: زۆر ڕاستە کە دەڵێن سەگەکەت برسی بکە دوات دەکەوێت.
ئەبو عەباسی طوسی وتی: ئاخر دەترسم یەکێك کولێرەیەکی بۆ ڕابگرێت ئەویش دوای بکەوێت و واز لەتۆ بهێنێت.

* بە ئەبو عەینائیان ڕاگەیاند کە خەلیفە وتویەتی: ئەگەر ئەبو عەیناء نابینا نەبوایە ئەوا هاوڕێیەتیمان دەکرد.
ئەبو عەیناء وتی: ئەگەر پێشەوای باوەڕداران چاوپۆشیم لێ بکات لە بینینی مانگ و نەخشی گوستیلەکان ئەوا من گونجاوم بۆ هاوڕێیەتی.

* هارون لە گوندێك ئافرەتێکی پیری بینی سەلامی لێ کردو پێی وت: تۆ لە کام هۆزەیت؟
ئافرەتەکە وتی: لە هۆزی (طيء).
هارون وتی: چی ڕێگری دەکات لە هۆزەکەتان کە یەکێکی وەك حاتمیان تێدا بێت؟

ئافرەتەکە وتی: ئەوەی رێگری دەکات لە خەلیفەکان کە یەکێکی وەك تۆیان تێدا بێت.

هارون زۆر سەرسام بوو بە وەڵامەکەی و پارەیەکی زۆری دایە.

وتیان ئەو پارەیە زۆر بوو.

وتی: بەخوا ئەگەر خەلافەتم پێ بدابایە مافی خۆیم بە تەواوەتی نەدەدایەوە.

* دەڵاڵێك هاتە لای پیاوێك و پێی وت: ئافرەتێکم لایە دەڵێی کەڵە نێرگزەو لێی مارە کرد، کاتێك پیاوەکە سەیری ئافرەتەکەی کرد بینی پیرو ناشیرینە بە دەڵاڵەکەی وت: فێڵت لێ کردم.

دەڵاڵەکە وتی: بەخوا فێڵم لێ نەکردویت من وتم: وەك کەڵە نێرگز وایە لەبەرئەوەی قژی سپی یەو دەموچاوی زەردەو قاچەکانیشی سەوزن بەوەی کە دەمارەکانی دەرکەوتوون.

* پیاوێك سەیری دوو برای کرد کە لە یەك دایك و باوك بوون و یەکێکیان جوان و باڵا بەرز بوو ئەوەی تریشیان کورت و ناشیرین بوو وتی: دایکتان درەختێکە ساڵێك بەری مۆز دەگرێت و ساڵێك بەری مازو.

* دەشتەکیەك ویستی خزمەتکارێك بکرێت وتیان: عەیبێکی هەیە.

وتی: عەیبەکەی چییە؟

وتیان میز لە جێگە دەکات.

وتی: ئەگەر جێگەی بینی با میزی تێ بکات.

* موحەمەدی کوڕی عبدالرحمن دەڵێت: جارێکیان پیاوێك بانگهێشتی برایەکی کرد بۆ ماڵەکەی خۆی و تا عەسر داینیشاند بێ ئەوەی هیچ خواردنێکی پێ بدات و زۆر برسی بوو، خاوەن ماڵەکە عودێکی هێناو بە میوانەکەی وت: حەزت لە چ ئاوازێکە بۆتی بژەنم؟

میوانەکە وتی: ئاوازی تاوە (مەقلێ).

* چەند کەسێکی هۆزی تەمیم چونە لای شێتێکی هۆزی ئەسەدو زۆر گاڵتەیان پێ کرد، شێتەکە پێی وتن: ئەی هۆزی تەمیم هیچ هۆزێك ناناسم لە هۆزی ئێوە باشتر بێت.

وتیان: بۆچی؟

وتی: هۆزی ئەسەد هیچ شێتێکیان تێدا نییە جگە لە من منیشیان بەستوەتەوە، ئێوە هەمووتان شێتن کەچی هیچیشتان نەبەستراونەتەوە.

* فەرمانڕەوایەك لە پیاوێك توڕە بوو فەرمانی کرد ڕیشی بتاشن، ڕیشتاشەکە بە پیاوەکەی وت: دەمت بکەوە.

پیاوەکە وتی: فەرمانڕەووا فەرمانی پێ کردی ڕیشم بتاشی یان فێری شمشاڵ لێدانم بکەی؟

* منداڵێك لەگەڵ چەند کەسێك نانی دەخوارد لە ناکاو دەستی کرد بە گریان وتیان: بۆچی دەگریت؟

وتی: خواردنەکە گەرمە.

وتیان: دەی بوەستە تا سارد دەبێتەوە.

وتی: جا بۆ ئێوە لێ دەگەڕێن سارد ببێتەوە.

* پرسیاریان لە پیاوێك کرد دەربارەی دەعوەتێك کە ئامادەی بوو بوو.

وتی: هەموو شتێکی سارد بوو تەنها ئاوەکەی نەبێت.

* چەند کەسێك بەلای پەهلولدا ڕۆیشتن کە لە ژێر درەختێك دانیشتبوو پێیان وت: ئەی پەهلول ئەگەر بتوانیت سەر ئەم درەختە بکەویت دە درهەمت دەدەینێ.

وتی: دەتوانم بێنن سەرەتا پارەکەم بدەنێ.

پارەکەی وەرگرت و هەڵی گرت پاشان وتی: قادرمەیەکم بۆ بێنن.

وتیان: ئەوە لە مەرجی ئێمەدا نەبوو.

وتی: لە مەرجی مندا هەبوو.

* پیاوێکیان هێنا بۆ ئەوەی لە سێدارەی بدەن پێیان وت: تەنها ئاواتێکت بڵێ پێش ئەوەی لە سێدارە بدرێیت بۆت جێ بەجێ بکەین؟

وتی: ئەگەر بیڵێم بۆم جێ بەجێ دەکەن؟

وتیان:بەڵێ.

وتی: ئاواتم ئەوەیە کە وازم لێ بهێنن و ئازادم بکەن.

ئەوانیش ئازادیان کرد.

* سێ سەد دیلیان هێنایە لای فەرمانڕەوایەك فەرمانی کرد سەری هەموویان بپەڕێنن، کاتێك خەریك بوو سەری گەنجێك بپەڕێنن هاواری کرد: ئەی فەرمانڕەوا دیلەکانت بە برسێتی و تینوێتی مەکوژە.

فەرمانڕەواکە وتی: باشە نان و ئاویان پێ بدەن.

کاتێك نانیان خوارد گەنجەکە وتی: ئەی فەرمانڕەوا میوانەکانت مەکوژە.

وتی: باشە، فەرمانی کرد هەموویان ئازاد بکەن.

* پیاوێك بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد پێیان وت: کاڵەکمان بۆ لە زەوی بێنە دەرەوە.

وتی: سێ ڕۆژ مۆڵەتم پێ بدەن.

وتیان: ئێستا دەمانەوێت.

وتی: خوای باڵادەست بەسێ مانگ کاڵەك پێدەگەیەنێت کەچی ئێوە سێ ڕۆژ چاوەڕێی من ناکەن؟!

* ڕۆژێکیان خەلیفەیەکی عەباسی لەگەڵ وەزیرەکەی بە لای پیاوێکی دەشتەکی پیردا ڕۆیشتن کە لەسەر پشتی وڵاخەکەی بوو چاوەکانی کەم بینا بوو بوون، وەزیرەکە ویستی تۆزێك گاڵتەی پێ بکات و دڵی خەلیفەش خۆش بکات، بە دەشتەکیەکەی وت: دەرمانێکت دەوێت بۆ چاوەکانت؟

دەشتەکیەکە وتی: بەڵێ ، خوا پاداشتی خێرت بداتەوە.

وەزیرەکە وتی: هەڵمی هەواو تۆزی ئاو تێکەڵ بکە لەگەڵ دووکەڵی بەفرو پاشان چاوتی پێ بڕێژە سودی دەبێت بۆت.

دەشتەکیەکە خۆی دانەواند لەسەر پشتی وڵاخەکەو دەنگێکی بەهێزی لێوە هات و وتی: ئەوە بگرەو لە ڕیشتی بدە لە پاداشتی ئەو وەسفەی کردت، ئەگەر زیادت کرد ئێمەش بۆت زیاد دەکەین.

خەلیفە ئەوەندە پێکەنی خەریك بوو لەسەر پشتی وڵاخەکەی بکەوێتە خوارەوە.

* پیاوێك پرسیاری لە شەعبی کرد: کاتێك دەستنوێژ هەڵدەگرم هەست دەکەم ڕیشم تەڕ نابێت.

شەعبی وتی: بە دەستەکانت تۆزێك بیگوشە.

پیاوەکە وتی: دەترسم هەر تەڕ نەبێت.

شەعبی وتی: دەی کەواتە شەوانە پێش ئەوەی بخەوی بیخە ناو ئاوەوە بۆ ئەوەی تا بەیانی باش بخوسێ.

* عبدالرحمن کوڕی مەخلەد دەڵێت: ئافرەتێك کولێرەیەکی دا بە پیاوێك کە لە گۆڕستان قورئانی دەخوێندو پێی وت: هەندێك قورئان لەسەر گۆڕی کوڕەکەم بخوێنە، ئەویش ئەمەی خوێند ﴿ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ ﴾ القمر:٤٨.

واتە: ئەو ڕۆژەی کە لە ئاگری دۆزەخدا بەسەر ڕوخساریاندا ڕادەکێشرێن، (پێیان دەڵێن) بچەژن ئازاری دۆزەخ.

ئافرەتەکە وتی: بەم شێوەیە قورئان لەسەر گۆڕستان دەخوێنرێت؟

پیاوەکە پێی وت: دەتەوێت بە کولێرەیەك ئەمە بخوێنم ﴿ مُتَّكِئِينَ عَلَى فُرُشٍ بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ وَجَنَى الْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴾ الرحمن:٥٤ ؟

واتە: پاڵیان داوەتەوە لەسەر جۆرە فەرشێك کە بەرەکانیان لە ئاوریشمی ئەستورە، وە میوە لێکردنەوەی ئەم دوو باخە نزیکە دەستە.

* هەژارێکیان لە گوندێك بینی وتیان: ئەوە چی دەکەیت لێرە؟

وتی: ئەوەی موساو خضر دەیانکرد.

مەبەستی ئەمە بوو ﴿ فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا ﴾الكهف ٧٧.

واتە: پاشان ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ناو خەڵکی شارۆچکەیەك (برسیان بوو) داوای خۆراکیان لە خەڵکەکە کرد.

* پیاوێك له‌گه‌ڵ كاروانێك ڕۆیشت بۆ بازرگانی هیچ قازانجێكی نه‌كرد كاتێك هاته‌وه‌ پێیان وت: سه‌فه‌ره‌كه‌ت چۆن بوو.

وتی: هیچ قازانجێكم نه‌كرد ته‌نها نوێژ كورت كردنه‌وه‌.

* دوو كه‌نیزه‌ك خرانه‌ ڕوو بۆ پیاوێك یه‌كێكیان هه‌ر كچ بوو ئه‌وه‌ی تریشیان كچێنی له‌ده‌ست دا بوو، ئه‌وه‌ی كچێنی له‌ ده‌ست دابوو وتی: له‌نێوان من و ئه‌ودا ته‌نها ڕۆژێك هه‌یه‌.

ئه‌وه‌ی كه‌ هه‌ر كچ بوو وتی:﴿ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴾ الحج: ٤٧.

واته‌: بێگومان ڕۆژێك لای په‌روه‌ردیگارت وه‌ك هه‌زار ساڵ وایه‌ له‌و ساڵانه‌ی ئیوه‌ ده‌یژمێرن.

پیاوه‌كه‌ یه‌كسه‌ر ئه‌وی هه‌ ڵبژارد.

* مه‌هدی كوڕی سابق ده‌ڵێت: ده‌شته‌كیه‌ك هاته‌ لای پیاوێك كه‌ قاپێك هه‌نجیری له‌پێش بوو كاتێك ده‌شته‌كیه‌كه‌ی بینی قاپه‌ هه‌نجیره‌كه‌ی له‌ ژێر جله‌كانیدا شارده‌وه‌ ده‌شته‌كیه‌كه‌ش چاوی لێ بوو كاتێك هات و لای دانیشت پیاوه‌كه‌ پێی وت: هیچت قورئان له‌به‌ره‌؟

ده‌شته‌كیه‌كه‌ وتی: به‌ڵێ.

پیاوه‌كه‌ وتی: ده‌ی شتێك بخوێنه‌.

ده‌شته‌كیه‌كه‌ وتی: ﴿ وَالزَّيْتُونِ (1) وَطُورِ سِينِينَ ﴾

پیاوەکە وتی: ئەی کوا ﴿التِّينِ﴾؟ واتە:هەنجیر
دەشتەکیەکە وتی: لەژێر جلەکانتە.
(ئایەتەکە بە شێوەیەیە ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ (1) وَطُورِ سِينِينَ﴾.

* سوفیانی کوڕی عویەینە وتی: ڕۆژێك سوفیانی سەوری بانگهێشتی کردین خورماو شیری مەییوی داینێ کاتێك خواردمان وتی: هەستن با دوو ڕکات نوێژ بکەین لە شوکرانەی ئەو خواردنەدا.
سوفیانی کوڕی وەکیع وتی: ئەوە خواردنێکی خۆشی دابایەنێ دەیوت هەستن با تەراویح بکەین.

* پیاوێك بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکردو دەیوت: من پێغەمبەر نوحم، گرتیان و لە سێدارەیان دا.
پیاوێکی شێت بە لایدا تێپەڕی و پێی وت: ئەی نوح ئەوە چییە کەشتیەکەت لەسەر ئەم دارە نیشتەوە؟

* حەفصی کوڕی غیاث دەڵێت: ئیدریسی ئەودیم بینی عەبدوڵڵای کوڕی هێنایە لای ئەعمەش و پێی وت: ئەی باوکی موحەمەد ئەوە کوڕی منە شارەزایە لە زانستی قورئان و زانستی شەرعی و لە ڕێزمانی عەرەبی و لە شیعری عەرەبیدا.

ئەعمەش بێدەنگ بوو پاشان پیاوەکە پرسیاری دەربارەی شتێك لە ئەعمەش کرد.

ئەعمەش پێی وت: پرسیار لە کوڕەکەت بکە.

* موعاویە بە پیاوێکی خەڵکی یەمەنی وت: گەلەکەت گەمژە بوون کاتێك ئافرەتێك بوو بە فەرمانڕەوایان.

پیاوەکە وتی: گەلەکەی تۆ گەمژەتر بوون کاتێك وتیان: ﴿اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ الأنفال:٣٢.

واتە: خوایە ئەگەر ئەم دین و بەرنامەو قورئانە ڕاستە، لەلایەت تۆیشەوە ڕەوانە کراوە، ئەوە بەرد لە ئاسمانەوە ببارێنە بەسەرماندا، یان بەڵاو سزایەکی بە ئێشمان بۆ بهێنە!.

ئایا نەیاندەتوانی بڵێن خوایە ئەگەر ئەم دین و بەرنامەو قورئانە ڕاستە هیدایەتمان بدە؟

* وەفدێك لە عێراقەوە هاتنە لای عومەری کوڕی عبدالعزیز، گەنجێکیان ویستی قسە بکات عومەر وتی: ئایا بە تەمەنەکان لە پێشتر نین؟

گەنجەکە وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران کارەکە پەیوەندی بە تەمەنەوە نییە، ئەگەر بە تەمەن بوایە ئەوا مسوڵمانان زۆر کەسی لە تۆ بە تەمەنتریان تێدایە.

وتی: ڕاست دەکەیت قسە بکە.

* شاعیرێك قسەی ناشیرینی بە موسلیمی کوڕی قوتەیبە فەرمانڕەوای خوراسان وت، پاش ماوەیەك وا ڕێکەوت کە ڕۆیشتە لای موسلیم، کاتێك چاوی پێ کەوت یەکسەر پێی وت: وەی لە حاڵت بە کام ڕووە دێیتە لام؟ شاعیرەکە وەڵامی دایەوە: بەو ڕووەی کە پێی دەچمە لای پەروەردیگارم، تاوانەکانم بەرامبەر بە ئەو زۆر زیاترن لە تاوانەکانم بەرامبەر بە تۆ.

* ئەبو عەیناء ڕۆیشتە لای ئیسماعیلی کوڕی بولبول لە وەزارەتەکەی کاتێك ڕۆیشتە ژورەوە پێی وت: بۆچی دوا کەوتیت؟

ئەبو عەیناء وتی: کەرەکەم دزرا.

ئیسماعیل وتی: چۆن دزرا؟

ئەبو عەیناء وتی: لەگەڵ ئەو کەسە نەبووم کە دزیویەتی تا پێت بڵێم چۆن دزی.

* ڕۆژێك ڕەشید لەگەڵ پیاوەکانی یارییان دەکرد بە یەزیدی وت: تۆ لەگەڵ عیسا بە ئەویش ڕەتی کردەوە.

ڕەشید وتی: وەی لە حاڵت سەرپێچی فەرمانی من دەکەیت؟

یەزید وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران من سوێندم خواردووە هەرگیز دژی تۆ نەبم نە لە ڕاستیدا نە لە گاڵتەدا.

* (معن بن زائدة) هەزار دیناری بۆ ئیبن عەیاش ناردو بۆی نوسی: هەزار دینام بۆ ناردویت و دینەکەتم پێ کڕیوە.
ئەویش بۆی نوسی: ئەوەی ناردت گەیشت، دینی خۆمم پێ فرۆشتیت جگە لە تەوحید نەبێت لەبەرئەوەی دەزانم کە حەزت لێی نیە.

* تەمامە کوڕی ئەشرەس دەڵێت: ڕۆیشتمە لای هاوڕێیەکم بانگی بکەم گوێدرێژەکەم لەبەر دەرگا جێ هێشت هیچ منداڵێك یان کارەکەرێکم لا نەبوو ئاگای لێ بێت تا دێمە دەرەوە، کاتێك هاتمە دەرەوە بینیم منداڵێك سواری بووە وتم: بێ ئەوەی مۆڵەتت پێ بدەم سواری گوێدرێژەکەم دەبیت؟
وتی: ترسام بڕوات بۆیە ئاگام لێی بوو بۆت.
وتم: ئەگەر ڕۆیشتبا پێم خۆشتر بوو لەوەی ببینم تۆ سواری بوویت.
وتی: ئەگەر وایە وا دابنێ کە ڕۆیشتوەو لێی گەڕێ با بۆ من بێت و سوپاسی منیش بەدەست بێنە.
نەمزانی چی پێ بڵێم.

* پیاوێك جەمەدانیەکی گەورەی لەسەر بوو پێیان وت: ئەو جەمەدانیە گەورەیە چییە؟

وتی: شتێك کە گوێ و چاوی تێدا بێت شایەنی ئەوەیە لە گەرماو سەرما بپارێزرێت.

* لە کاتی جەنگی یەکەمی کەنداودا سەربازە ژنەکانی سوپای ئەمریکی چوونە ناو خاکی سعودیە، یەکەم جار بوو ئافرەتی سفور لە ناو سعودیەدا ببینن، پیاوێکی سعودی کە غیرەتی هەستا بوو بە یەکێك لە سەربازە ژنەکانی وت: ئایا شەرم ناکەیت قژت داناپۆشیت لە کاتێکدا تۆ لەناو وڵاتێکی مسوڵمان دایت؟
یەکسەر وەڵامی دایەوە: ئەی تۆ شەرم ناکەیت کاتێك ئافرەتێکی کافر بەرگریت لێ دەکات؟

* سلێمانی کوڕی عەبدولمەلیك بە ئەبو حازمی وت: باشە بۆچی ڕقمان لە مردنە؟
وتی: لەبەرئەوەی ئێوە دواڕۆژتان وێران کردووەو دونیاتان ئاوەدان کردۆتەوە، ڕقیشتان لەوەیە کە لە ئاوەدانیەوە بچنە کەلاوەو وێرانە.

* پیاوێك هاتە لای داود پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێت کە نانێکی ڕەقی دەخوارد پێی وت: چۆن حەزت بۆ ئەو نانە ڕەقە دەچێت؟
وتی: وازی لێ دەهێنم تا حەزم بۆی دەچێت.

* پیاوێك داوای ئافرەتێکی کرد وتیان: ئافرەتەکە دە خانووی هەیە، پارەو زێڕو زیوێکی زۆر زۆریشی هەیە، ئەی تۆ چیت هەیە؟
وتی: ئەگەر ئەوەی ئێوە دەیڵێن ڕاست بێت ئەوا ماڵەکەی ئەو هەتا دەمرین بەشمان دەکات و لێشمان زیادە، بۆیە پێویست ناکات دەربارەی ماڵ و سامانی من پرسیار بکەن.

* لە پیاوێکیان پرسی: کامیان جوانترە دایکت یان مانگ؟
وتی: ئەگەر دایکمم بینی مانگم بیر دەچێتەوە، وە ئەگەر مانگم بینی دایکمم بیر دەکەوێتەوە.

* شێخێك لای هەندێك لە هاوڕێکانی بوو جبەکەی بە دیواری مەدخەلەکەوە هەڵواسی بوو، کاتێك ویستی بڕوات بینی یەکێك گاڵتەی بە جبەکەی کردووەو وێنەی دەموچاوی گوێدرێژێکی لەسەر کێشاوە، شێخەکە بە هێمنی جبەکەی لەبەر کردەوەو وتی: کێ دەموچاوی بە جبەکەی من سڕیوە؟!

* ڕۆژێکیان حەجاج مەلەی دەکرد خەریکبوو بخنکێت، لەو کاتەدا زانایەك کە بەوە بەناوبانگ بوو زۆر ڕقی لە حەجاجە چاوی پێکەوت خێرا جلەکانی داناو خۆی فڕێدایە ناو ئاوەکەو ڕزگاری کرد، کاتێك لە ئاوەکە هێنایە دەرەوە حەجاج وتی: باشە ئەی بۆ دەیان وت تۆ زۆر ڕقت لە منە؟

زاناكه‌ وتی: ئه‌وه‌ی ئه‌م قسه‌یه‌ی كردووه‌ ڕاستی كردووه‌.

حه‌جاج به‌ سه‌رسوڕمانه‌وه‌ وتی: كه‌واته‌ بۆ ڕزگارت كردم و نه‌تهێشت بخینكێم؟

زاناكه‌ وتی: به‌خوا له‌ خۆشه‌ویستیان ڕزگارم نه‌كردووی، به‌ڵكو ترسام به‌ شه‌هیدی بمریت و بچیته‌ به‌هه‌شت!

## سەرچاوەکان


- الأجوبة المسكتة/ ابن أبي عون
- الأجوبة المسكتة / محمد سعيد العاني
- الأجوبة والأسئلة المسكتة / د.حسين حسن طلافحة
- الأذكياء / ابو الفرج ابن الجوزي
- التذكرة الحمدونية / ابن حمدون
- قصص العرب / إبراهيم شمس الدين
- من نثر الدر / منصور بن الحسين الآبي
- نوادر ظرفاء العرب / محمد فتحي عيسى حماد
- المجتنى/ أبوبكر محمد بن الحسين بن دريد الأزدي
- روض الأخيار المنتخب من ربيع الأبرار / ابن الخطيب
- لباب الآداب / اسامة بن منقذ
- المراح في المزاح / ابو البركات الغزي
- أخبار الظراف والمتماجنين / ابن الجوزي
- المحاسن والمساوئ / ابراهيم بن محمد البيهقي
- أمالي المرتضى غرر الفوائد و درر القلائد/ الشريف المرتضى
- بهلول ومواقفه المشرفة / ناصر الباقري البيدهندي
- أخبار جحا / عبدالستار أحمد فرّاج

- الكشكول / البهاء العاملي
- نوادر البخلاء / مصطفى علي
- نوادر أشعب / مصطفى علي
- ١٠٠٠ قصة و قصة / د.مصطفى مراد
- قصص علمتني الحياة / محسن جبار
- ساعة و ساعة / محمود المصري
- صحيفة الإستقامة
- ملتقى أهل الحديث
- شبكة الفصيح للعلوم العربية

ئامادەکردنی PDF

محمد پشتیوان محمد

2017-10-1